# مامۆستا ئەڵێ 4

## شیعر

د.نوزاد یحیی باجگر

هەولێر - کوردستان

2021

ناوی کتێب: مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ
بەرگ: بەرگی چوارەم
نووسەر: د.نوزاد یحــیی باجگـر
دیزاینەر: سمیە مرادی
بڵاوکراوەی: زانکـۆی جیهان/ جیهان پرێس28
چـاپ: چاپی یەکەم (2021) هەولێر

بۆ داونلۆدکردنی ئەم کتێبانە بە بێ بەرانبەر لەم ماڵپەرانە دەست ئەکەوێت
www.nawzadbajger.org
www.nawzadbajger.net
chairman@cihanuniversity.edu.iq

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان | وەزارەتی رۆشنبیری
ژمارەی سپاردنی(196)ی ساڵی (2017)ی دراوەتێ

زانکۆی جیهان    جامعة جيهان

CIHAN UNIVERSITY

# سوپاسنامە

* بۆ رۆحی دایکم.. و.. باوکم

* و خێزانم.. منداڵەکانم.. نەوەکانم

* و بۆ هەموو عاشقان.. هەموو چەشن

د. نەوزاد باجەلان
٢٠٢٠/١٢/١٥

www.cihanuniversity.edu.iq

# د. نەوزاد یحیـی باجـکـر .. لە ئەرشیفی بیـرەوەریمـدا

## د. وریـا عمـر امـین

من زۆر لە نزیکەوە د. نەوزاد دەناسم ، چ وەك هاوڕێیێکی دێرین ، چ وەك خزمێکی نزیك.
د. نەوزاد لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە یێکێ بوو لەو ڕۆشنبیرە ئەدەبدۆستانە کە خولیای خوێندنەوە و نووسینی کوردی و کوردایەتی بوون..خۆشی لە شیعرێکیدا بە بۆنەی مردنی ( سامی شۆڕش ) ـەوە باسی ئەو ڕۆژانەی خۆی دەکات و دەڵێ:

سامی ..ئەی شۆڕش
بحەسێوە...بحەسێوە...بحەسێوە
لە سکونی موتلەقدا
لە یادمە ١٩٦٥
لە گازینۆی سیروان لە بن قەڵا
گەنجان ... دۆمینە و تاوڵە
ئێمەش کوردایەتی ئازارمان بوو
مڵاکی چای ناو پیاڵە
ئاوازی ئەی ڕەقیبمان بوو
کوردستان لە هەولێرەوە پێڕەومان بوو
....
هەر ئەڕۆین .. ئەڕۆین .. ئەڕۆین
ڕێگامان مەرگمانە
درووستکردنی ئاوەدانیی کوردستانمانە

وا بوو لە کولێژی پزیشکیی زانکۆی مووسڵ وەرگیرا و لە ساڵی ١٩٧٤ بوو بە پزیشك ... بەمە نەختێ لە بوار دابڕا بەڵام وازی لێ نەهێنا. پەیوەندی و عیشقی بۆ ڕۆشنبیری و وشەی کوردی بەردەوام بوو.. لە ساڵی ١٩٨٧ خوێندنی باڵای لە زانکۆی بەغداد تەواوکرد و بوو بە پسپۆر لە نەشتەرگەریی دڵدا کە لە بوارە هەرە زەحمەت و سەخت و ترسناکەکانی نەشتەرگەرییە ...ماوەیێك لە بەغداد خەریکی پزیشکییاتی بوو ..پاشان گەڕایەوە هەولێر و ڕووی کردە کارکردن لەگەڵ براکانی.
د. نەوزاد یێکێکە لە خێرخوازە دڵفراوانە پەخشندە هەرە چاڵاکەکانی کوردستان و شاری هەولێر .. کوردپەروەرێکی جەرگسۆز و دڵسۆزە ..عیشقی بۆ زانست و ڕۆشنبیری و خزمەتکردن و ئاوەدانکردنی کوردستان وای لێ کردووە توانینە ئابوورییەکەی خۆی بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵ تەرخان بکات و چەند دەزگاییێکی خزمەتگوزاری دامەزرێنێ .. دیارترینی ئەمانە زانکۆی جیهانە لە شاری هەولێر ، پاشان لە سلێمانی و دهۆکدا..
زانکۆی جیهان گەورترین و پێشکەوتووترین و شەکاوەترین زانکۆکانی جیهانی سێیەمە..تەلارێکی زانستیی بەرزی سەرکەشە.. گەورەترین ڕۆڵ دەگێڕێ لە بڵاوکردنەوە و بووژانەوە و پتەوکردنی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری و وشیاریی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا..

د. نەوزاد وەك من بیناسم مرۆڤێكی لە ڕادەبەدەر چالاك و بە توانینە..مێشكێكێكی دینامێكیی هەیە لە ئەنجامدانی كارەكانی..دەیان دەزگای گەورە بەڕێوە دەبات...ئاگادارم ڕۆژێ بە لای كەمی ١٢ سەعات بێ وەستان كار دەكات و بێ ئەوەی هیچ هیلاكبوونێكی پێوە دیار بێ.. سەرەڕای ئەم هەموو بێ كاتی و سەرقاڵییە لە ڕادە بەدەرەی موچڕكی هونەر و شیعر و ڕۆشنبیری بەری نەداوە و بەردەوام بە گیانیا دەگەڕێ.. كتێبخانەیێكی گەورەی كتێبە كوردییەكانی لە ماڵەوە پێكهێناوە كە بە سەدان بەڵگەنامە و دەسنووسی بە نرخ و دەگمەنی تێدایە... مۆزەخانەی ماڵی فۆلكلۆری كوردەواری و سەنتەری ڕۆشنبیری و دەزگای بلاوكردنەوە و سەنتەری بەڵگەنامەكانی مێژووی كوردی دامەزراندووە.ئیزگە و كەناڵی تەلەفزیۆنی كوردیی تایبەتیی خۆی هەیە..چالاكەوانێكی ژینگەییە ، بە هەزاران نەمام و گوڵ و درەختی لە چیمەنەكانی زانكۆكە و شوێنی تردا ڕواندووە ..و گەلێ جموجۆڵی تری ڕۆشنبیری و زانستی و كۆمەلایەتی و پەروەردەیی. دەستی یارمەتی درێژدەكات بۆ هەر كارێكی ڕۆشنبیری و پشتگیریی دەكات.. لە ڕاستیدا ئەوەی د. نەوزاد بۆ بواری زانست و ڕۆشنبیریی كوردیی كردووە كەمویێنەیە . لەگەڵ ئەمەشدا بەردەوام دەخوێنێتەوە و شیعر دەنووسێ و تابلۆ دەنەخشێنێ . تا ئیستا ٦ بەرگی بلاو كردۆتەوە بە دەرهێنانێكی جوان و چاپێكی قەشەنگ و ڕازێنراو بە تابلۆكانی خۆی. لەگەڵ ئەلبۆمێكی گەورەی تابلۆكانی دەركردووە... شایانی باسە كە هەندێ لە تابلۆكانی بیردەربڕی سەرنجڕاكێشن.

سەبارەت بە شیعرەكانی ، د. نەوزاد بە زمانی كوردی و عەرەبی دەنووسێ ..زۆربەی بابەتەكانی لەبارەی خۆشەویستیی نیشتمان و پرسی ژیان و بوون و مردنە. ئەم شێوازە شیعرییەی د. نەوزاد لە ئەدەبی جیهانیدا باوە و بە **Telegramic Poetry** (شیعری برووسكەیی) ناودەبرێ.. تێیدا بە یەكدوو دێڕ بە لادانی زمانی و لۆژیكی و دەربڕینی لێڵ و نامۆ سەرنج ڕادەكێشێ. ئەم جۆرە نووسینە لە ئەدەبی كوردیدا بەرچاو ناكەوێ ... شیعرەكانی د.نەوزاد سەر بەم (ژانرەن). سۆز و ناسكی و بیری وردیان لێ بەدی دەكرێ. ئەمە لە لایێك ..لە لایێكی ترەوە شیعرەكانی د. نەوزاد سەرنجێكی زۆری ڕاكێشاوە و زۆر كەس بە دوایا دەگەڕێ .. بە (پێوانەی جیهانی) ش ئاستی هەر شتێك لە هەر بوارێكدا بە پێی ڕێژەی داواكردنیەتی. بە چ پێوانەیێك ئاستی گۆرانییێك یا فیلم یا شانۆ یا كتێبێك هەڵدەسەنگرێت؟ وەلامەكەی لەوەدایە بە ژمارەی داواكردن و ڕوو تێكردنیان... گەر لەم ڕوانگەیەوە سەیری شیعرەكانی د. نەوزاد بكەین دەبینین ژمارەیێكی یەكجار زۆر خوێنەر بە پەرۆشەوە لێیان دەگەڕێن ، كە ئەمە خۆی لە خۆیدا هێما و پێوانەیە.

د. نەوزاد گەلێ دەربڕین و وێنەی شیعریی سەرنجڕاكێشی هەیە كە مایەی تێڕامانن و دەچنە بواری جەدەلییەتەوە ..بە تایبەتیی ئەوانەی لەبارەی پرسی فەلسەفیی ژیان و مردنن .. و هەندێ دربڕینی بوێرانەشی هەیە لە بارەی بوون و كردگار كە لە كۆمەڵە شیعرییەكانی (فی اللّٰه) و (الموت) دا بەرچاو دەكەون. لەوانەی ئیستا لە بیرمە ، كە لە شیعرە عەرەبییەكانییەوە وەرگیراوە:

ئەمەوێ مردن لە مردن تێركەم
تا مردن تێر بێ لە مردن

***

ساڵەها هەوڵم دا وێنەیێك بكێشم واتای نەبێ نەمتوانی

***

پەیژەكانی سەركەوتن بەرەو بێ پایانی
لەوێوە پایانی دەست پێ دەكات

د. وریا عمر امین

# مـامـۆستـائـەڵـێ

یان مامۆستا دبێژیت... چ دبێژیت، هەتا نە چییە د ناڤ کەسایەتییا مرۆڤیدا باش فێرنابییە ئەلفوبێیا نیشتمان پەروەرییێ د گێرانا ئاخێ مامۆستا د ئەڤان بەرگاندا دبێژیت ب ستایلەکێ تازە و ب شێوازەکێ شیعری و ب سەلیقەکا زێدە جوان و ب زمانەکێ سادە و ساکار د هەمی ئەڤان پەندێن خوەدا مە دکێشیتە ڤیانا وەلاتی و ڤیانا مرۆڤان، لەورا ب هەستەکێ نیشتمان پەروەری وانەیێن خوە دبێژیت، نە شاعرم نە هونەرمەندم لێ خواندنا من بۆ ئەڤان پەندان مامۆستا هەم شاعیرە و هەم هونەرمەند، بەلکو زێدەتر زانا و ژێهاتی و مێشك دەولەمەندە، جاران مامۆستا وانەیان دبێژیت و جاران وەفادارییا خوە بۆ کەس و کار و عەردێ لێ مەزن بووی، هەڤلێرێ دکەتە ئارمانج و بەردەوام د لێگەریانێدایە بۆ روناهییەکا ئەبەدی، ئەوژی نیشتمان و سەربەخۆیا وەلاتییە، ل ئەڤێرێ جهێ ئاماژێیە بێژین، کو مرۆڤە یێ ئەڤان شیانێن دارایی و بەرنیاسی کو دەولەمەند و پزیشك ب ئەڤی ڕەنگی مال و ملکێ خوە بکەتە د خزمەتا گەل و مللەتی دا، وەکو شاعێرەکێ ژێهاتی و رەوشەنبیرەکێ مەزن و هەر کەسێ بۆ جارا ئێکێ شعرێن دیوانا مامۆستای (ئەڵێ) بخوینیت دێ وەسا هزر کەت زێدە د سادەنە، لێ ب دیتنا من ژ کویراتییا دلی دەردکەڤن، ژ حەزەکا مەزنا ئاخ و وەلاتی دەردکەڤن.

ل ئەڤێرێ دکتۆر (نوزاد یحیی باجگر ) چەندین پەیام ئێن مەزن هەم وەکو هەلویست و هەم وەکو ئامۆژگاری بۆ کەسانێن نیشتمان پەروەر بۆ ئەڤی نەوەیێ تازە کو بزانن ئەڤ سەربەخۆیە و ئەڤ ئارامییە و ئەڤ ئالایە ژ ئەنجامێ شورەش و بەرخودانێ هاتینە.

پەیڤێن شرینێن دکتۆری بکارهینانەکا هونەرییا بلند، هەمی دەربرینێ ژ ڕاستییێ دکەن، نەخاسمە دەمێ دبێژیت:

ڕاستی..... بلێ

ئەگەر........ بشمری

بەلێ، مامۆئێاڤاهییێ خوە ل سەر ڕاستییێ ئاڤاکرییە، دیسا هەتا مرۆڤ نێزیك نەبیت مرۆڤ نازانیت کو چ ئالی نەماینە دکتۆری ئیشارەت پێ نەدای، هەمی ژی دکەڤنە د چارچوڤێ زانین و زانست و پەروەردێدا و دبێژیت: (خوێندن بەنرخە) بەلێ مامۆستا، هەر چییا تە د ئەڤێ دیوانێدا گوتی یا ب نرخ و بهایە و ئامۆژگارییێن ب بهانە، ئەز دبینم هەر بەیتەکا شعرێ کەڤالەکێ جوانە و یێ کاریگەرە و ژ هەژییە ل هەمی ژورێن قوتابخانا و مالان بهێنە هەلاویستن، تێر بژین و تێر تەمەن بن.

پرۆفیـسۆر دکتـۆر
ئیـبراهـیم ئەحمـەد سمۆ

# خوێنەری خۆشەویست ..

ئەو کۆبەرهەمەی بەر دەستت (مامۆستا ئەڵێ)، بەرهەمی هزر و بیری (د. نەوزاد یەحیا باجگر)ە، لە شێوە و ناوەرۆکی شیعری ئازاددا گوزارشتییان لێ کراوە. ئەم شیعرانە دەچێتە نێو خانەی بروسکە شیعرە یا (شیعری برووسکەیی Telegramic Poetry یا وێنەی شیعری ، شیعری وێنەیی سەرنج ڕاکێش . هۆکاری سەرنج ڕاکێشی شیعرەکان بۆ گەڵێک هۆ دەگەڕێتەوە، بەکورتی بەم شێوەیە شرۆڤەیان دەکەین.

ئەم کۆبەرهەمە شیعرییە (مامۆستا ئەڵێ)، دوای ئەزموونی شیعری (فی اللە، الموت، کوردستان، پێشمەرگە، وشە دەچێنم، أزرع الکلمات، زنجیرە پەرتوکی کودستان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا) دێت، بریتییە لە چەندین بەرگ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بەرهەمی تێڕامانی هزرن لە بواری فەلسەفەی بیری مرۆڤایەتی و لە تێگەیاندنی بەرامبەر لە پەیامی هزردا بۆ بنیاتنانی مرۆڤ و نەشونوماکردنی وەرگر، ئەوەیان لەناوەڕۆکدا.

لە ڕوخساریشدا شیعرەکان گرنگ نین سەر بە چ ژانرێک بن، لای ئەوی شاعیر شێواز خۆیەتی و شوین پێی کەسی پێوە دیار نییە و لە کەس ناچێ خۆی نەبێ، هەروەك ڕەخنەگری فەرەنسی (جۆرج بۆفۆن) گوتەنی: مرۆڤ خۆی شێوازە. لەم شیعرانە و سەرجەم شیعرەکانی (د. نەوزاد) دا هەست بەو بۆچوونە ڕەخنەییەی شێوازی هونەری گوزارشتکردن دەکەین.

لەکاتێکدا لە ئەدەبیاتی مرۆڤایەتیدا نموونەی شیعری (جاك بریفەر ووڵات ویتمان و شیعری هایکۆی یابانی) و لە شیعرو ئەدەبیاتی کوردیشدا شیعری چوارینە و پۆستەرە شیعر و برووسکە شیعر سەر بەو ژانرەن کە (د. نە وزاد یەحیا باجگر) شیعرەکانی بەلادانی زمان و دەربڕینی لێڵ لە هەندێ گوزارشتدا سۆزو ناسکییەکی دیکەی بەخشیوە، سەرباری بوێری لە دەربڕین نووسیندا و نەهێشتنەوەیان بە ناکامی لە نێو ناخ و زاردا.

بوێـری و سـادەیی لـە دەربڕینـدا گـەر خاسـیەتی هونـەری شـیعری ئـەو بێـت، مەبەسـت لێـی لای خـودی د. نـەوزاد یەحیـا باجگـر چ لەشـیعرەکانی یـا تابلـۆ هونەرییەکانیـدا ئاسـوودە بوونـی نـاخ و بیـرە لـەو جەدەلییاتانـەی کـە هـەر دەبـێ گوزارشـتیان لـێ بکرێـت، بـۆ ئـەم هەژانـەی نـاخ و هزریـش لـە مێـژە گوتویەتـی:

نە شاعیرم، نە هونەرمەند
مێشکی خۆم دەکەم دەوڵەمەند

بەگشـتی ناوەرۆکـی شـیعرەکانی (د. نـەوزاد) دەچێتـە نێـو بابەتـی خۆشەویسـتی مـرۆڤ بـۆ نیشـتیمان، بـۆ زانسـت و تێکۆشـان و بنیاتنانـی خـود و پێگەیشـتن لـە تێگەیشـتندا، پرسـی ژیـان و مـەرگ و مانـەوە لـە نەمرییـدا بـە کار و کـردەوەی چـاك، هـزری داهێنـەر و بنیاتنەرانـە، نابـێ ئـەوە لەبیـر کەیـن لای ئـەوی ئەفرێنـەر هەمـوو شـتەکان واتایـان هەیـە: ئەوەشـیان ترۆپکـی گەیشـتنی بـە مانایـە بـە مەبەسـت، سـەیرکەن چەنـد جـوان گوزارشـتی لـە بـێ مانایـی کـردووە:ـ ساڵەها هەوڵمـدا وێنەیـەك بکێشـم واتـای نەبـێ، نەمتوانـی.

د. محەمەد خدر مەولود
زانکۆی جیهان
هەولێر ٢١-١٢- ٢٠١٦

# مامۆستا ئەڵێ

ئەی ... گەلعو ...
پێش ئەوەی لەدایك ببی
ئێمە .. کوردستانمان ..
پاراستوە .. و .. پێگەیاندوە
بە دونیامان .. ڕاگەیاندووە ..
ئاگرمان .. پەنگر ..
ئینجا .. بۆ .. ئێوەمان
بەجێهێشتوە
بیپارێزن ...
بیپارێزن ...

د. نوزاد یحیی باجگر
31/8/2014
هەولێر.مال

# مامۆستا ئەڵێ

حەسرەتی .. سووتانی سوودمەندی
سوودمەندی ... هاوارمان
سووتا .. و .. حەساوە
ئەسووتێم .. بەو حەسرەتە
ئەسوتێم .. ئەسوتێم.

د.  نوزاد یحیی باجگر
4/9/2014
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵێ

حەوانەوە .. لەحەواندن
گەلاکسی .. ژین .. ژیانی حەوانەوەیە
یەکەم جارە .. بحەوێمەوە
لە .. دەرەوەی خۆم
هەر .. وەك ..پڕۆسەی ژیان
لەدەرەوەی ... کەون.

د.  نوزاد یحیی باجگر
4/9/2014
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

فیکری ئازاربەخش .. بۆ مرۆڤـ
.. بۆ ژینگە
.. بۆ هەست
زەندیقیە .. زەندیقیە.

د. نوزاد یحیی باجگر
4/9/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

ئێستا .. سەرسامی .. فکر .. و .. ناخ
ئەڕژێنێ .. خوێن .. و ..ئازار
لێ ی .. ئەڕوێ ..
قین .. خوێن .. ڕەشبینی

د. نوزاد یحیی باجگر
4/9/2014
ماڵ-دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

ڕۆمان .. ئەیان ووت
ئێمە ..ڕۆڵەی گورگین
بە .. شیری پەروەردە .. بووین
ئەگەر شارستانی
ڕۆما .. لە شیر .. گورگ
بەخێو کراوە
ئێمە .. بە شانازیەوە
کەروێشك .. بزن .. مەڕ
بە خێو ئەکەین
ئاسایی .. لە ژیان .. ژیاوین
چی کوشتن .. چی کوشتار ؟!

د. نوزاد یحیی باجگر
4/9/2014
ماڵ-دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

پێت ئەڵێم
دوایی ... دواییمە
دوایی .. یەکجاریە
ئێوە .. وەرن .. پێم بڵێن
ئامانجی .. ماڵ ئاوایی .. چیە ؟

د. نوزاد یحیی باجگر
4/9/2014



# مامـۆستا ئـەڵـێ

پێتان .. ئەڵێم .. بەڵێنم ..
بەرەلای خستە خەیاڵم
هەتا .. هەتایی
من .. و .. خەیاڵم
ئاشت .. نابینەوە.

د. نوزاد یحیی باجگر
4/9/2014



# مامۆستا ئەڵێ

ئەگەر ...
ئەرك .. و .. ئەركەوانەكان
ئەگەریان .. ڕواندبایە
لەسەد هەزار ئەگەر .. ئەگەرێك ناڕوێ
هەموو ئەگەرەكان .. هیشك ئەبێ.



د. نوزاد یحیی باجگر
5/9/2014

# مامۆستا ئەڵێ

شارستانی .. لەشار دروست بووە
لەهێزی زانین .. بە دەستبەسەری پیشەیی
ئاوەدان .. بووە
لە باوك ..و .. باپیران .. ون .. نەبووە.

د. نوزاد یحیی باجگر
4/9/2014



# مامۆستا ئەڵێ

سەوزی .. ژیان
ڕۆژانی .. ژوانیا
ژانی .. ژوان
ژینی .. سەختی ژان.

د. نوزاد یحیی باجگر
5/9/2014
هەولێر – مال دریم ستی



# مامـۆستا ئـەڵێ

سەیری .. مامۆستا بکەن
کە مۆمێکی ڕۆناککەرە
مۆدێلێکی .. شارستانیە
شارستان .. زانست .. پەروەردە.

د. نوزاد یحیی باجگر
5/9/2014
هەولێر – مال دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

چەند جار سوێندم خوارد
بیرت نەکەم
خۆشەویستم .. قەڵغانمە
لەسێبەری .. خۆشەویستیەوە
چونکە خاوەن سوێند ..
خاوەن خۆشەویستیە
بە پەلکە .. کۆڵەوە ..

د. نوزاد یحیی باجگر
6/9/2014



# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگا .. خۆزگەکانی .. خۆزگاکانم
خۆزگەیان .. خۆزگا .. هەبووایە
خوێتی .. خەم هەڵگرم
خۆزگای .. هەبووایە
خۆزگەکانم .. خۆزگای سوتانی
خەڵوزی  هەبووایە.

د. نوزاد یحیی باجگر
6/9/2014



# مامۆستا ئەڵێ

خەمی .. خەو دیتنم
بڕیار .. بایە
خۆشی خەونی خومار بایە
دیتنی خەونی .. بێ خەمی بایە.

د. نوزاد یحیی باجگر
6/9/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەی مانگ
هەڵقوتدانی شەراب
و .. هەناسەت
لە کەون ..
شەپۆڵی دەنگەکانی
بیستراوە.

د. نوزاد یحیی باجگر
21/5/2014

# مامـۆستا ئەڵێ

گەیاندنی .. گەیاندن کەمی ماوە
سەرشۆڕی .. سەرشۆڕ زۆری نەماوە
پەڕەشوتی .. نەدۆزراوە نەکراوە.

د. نوزاد یحیی باجگر
21/5/2014



# مامۆستا ئەڵێ

خەون .. بە .. خەم
ئەبینم .. لە ڕوناکی
لە تاریکی هەست .. ئەبینم
تیشکی ڕوناکی مەبەستا.

د. نوزاد یحیی باجگر
21/5/2014



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

له بیر .. و .. بڕوا
نەبوو .. ژیری مامۆستا
ئەو .. هەڵمەتی .. ئێستا
کە .. هەڵسا
تکایە .. تکایە
مەیوەستێنن
ژیری .. مامۆستا

د. نوزاد یحیی باجگر
21/5/2014

# مامۆستا ئەڵێ

بە هەستی .. شاعیر شعر ئەبێژم
لەناخی .. میوزك ..
میوزك .. ئەبەخشم
بۆ .. هەموو .. ووڵات
بۆ .. ئەوانەی .. هەڵات
لە خۆیان .. و .. ووڵات.

د. نوزاد یحیی باجگر
21/5/2014

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

ڕوناکی تیشکی زەردەشتمان کوژرا
بە دووکەڵی سوتاندنی شارستانیمان
لە دوو بەشی .. دژایەتی خۆمان
ئاگرمان کوژرا .. بە سوتاندنمان
---
بەسە .. تورك .. عەرەب .. فارس
بە ئامێری ئەمریکا .. بمانکوژن
بەسە .. بەسە
با بەکوردایەتی .. بپارێزین
یەکڕیزی .. خۆمان.

د. نوزاد یحیی باجگر
21/5/2014

# مامۆستا ئەڵێ

چەرخی کورد .. کوێر بووە
لە بەینی شیر .. و .. خەنجەری
فرس .. و .. تورك
دوێنێ .. و .. ئەمڕۆ
خودا بکا .. ڕزگار .. بین سبەینێ.

د. نوزاد یحیی باجگر
21/5/2014



# مامـۆستا ئـەڵێ

کەی .. دێتەوە
کەی ..دێتەوە
کاتی پیریم .. کەی دێتەوە
لەدەستم .. نەچوو
هەرگیز .. دێتەوە ..



د. نوزاد یحیی باجگر
21/5/2014

# مامۆستا ئەڵێ

هاوار .. هاوارم کرد
پیشەمیان .. کوشت
پێشتر .. ئامۆزامیان کوشت
بە جێشیان .. هێشت
خودایا .. سوپاس
شەهیدان .. سوپاس
فرمێسك .. سوپاس
بۆ ئێمەش .. سوپاس
توانیمان .. ئازادی بچێنین .. و ..
بدورین.
سوپاس.

د. نوزاد یحیی باجگر
21/5/2014

# مامۆستا ئەڵێ

ئادەمیزاد .. بەهێزترە .. لەبەرد
بەرد .. بە هێزترە .. لە ئاو
ئاو .. بەهێزترە لە ئادەمیزاد ..
کێ .. بەهێزە ..
هەموویان هێزیان لە ئاوە ..

د. نوزاد یحیی باجگر
21/5/2014



# مامۆستا ئەڵێ

ئادەمیزاد .. بەهێزترە
یان ڤایروس ؟!
دەمێنێتەوە .. سەر پێوەر
هی ئادەمیزاد .. یان ..
ڤایروس.

د. نوزاد یحیی باجگر
8/5/2014

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

پشوو .. ئەزانم چەند منت
خۆش .. دەوێ
لە هۆشمەندی ئادەمیزاد
زیاتر.

د. نوزاد يحيی باجگر
8/5/2014



# مامۆستا ئەڵێ

خۆشی .. ژیان ژانیش ئەبێ
ئازاری مردن .. خۆشیش ئەبێ
ژان .. و .. خۆشی
لەژیان .. و .. مردنیش ئەبێ.

د. نوزاد یحیی باجگر
7/5/2014
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

بژی .. ژیانی زیندوو .. لە مردوو
وە ژیانی .. زیندوو .. لە .. زیندوو.

د. نوزاد یحیی باجگر
7/5/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کەس .. لەجیاتی کەس
نامرێ
مردن .. هی کەسایەتیە.

د. نوزاد یحیی باجگر
7/5/2014



# مامۆستا ئەڵێ

سوودمەندی ... سود
بەخشینی خۆشی درووود
بۆ .. ئەوانەی .. بێ سوود

د. نوزاد یحیی باجگر
7/5/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

مالو .. مالو .. و .. مالو
خەلیقەت .. ئەجووڵێ
ژیانی ژیانلەبەریش
ئۆتۆمەکانی بەردیش
هەموو .. سەما ئەکەن .. ئەخولێنەوە
بۆ عەشقی سری دروستکراویان
ئەکرێنەوە.



د. نوزاد یحیی باجگر
7/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

فڕینی مەل .. و .. فڕینی تەیارە
و .. بەرز بوونی کۆلارە
یەك ئەساسن
فڕینی مەل .. هی پەروەردگارە
فڕینی تەیارە .. هی زانستی دروستکارە



د. نوزاد یحیی باجگر
7/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

لەناو درەخت .. و .. تەیر .. و .. ئاژەڵ
سەربەستی سەروەری عەقڵی دال
عەقڵی دامەزرێنەری ماڵ .. و .. حاڵ
ئەچەسپێنێ .. یەکانەی پەروەردگار.

د. نوزاد یحیی باجگر
7/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

توندو .. تیژی
تەوری نەزان .. و .. بێ دەسەڵاتە
دڕندایەتی ناخی ئاژەڵ
زاڵ بووەتە سەر شارستانی
وە ... پیرۆزی ژیان
وە ... خاوەنی بڕوا.

د. نوزاد یحیی باجگر
7/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

نەوتی ڕەشمان
ڕۆنی ژیانلەبەری ژینلەبەرمانە
ئێسکمان .. ماسولکەمان
ئەبێتە نەوتی .. بەرهەمیان
گەرمی خۆر .. هیشکی زەوی
ئەسوتێنی .. ژیانی سەر زەوی
بۆ هێزداری .. هێزی .. وزە .
ئەمەیە ..
سوڕانی ووزە .. لە زەوی.

د. نوزاد يحيى باجگر
4/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

سەهۆڵ .. بەفر .. تەزرە
خەرمانیان .. هەڵبەست
بونە .. مەبەست
هەر سێکیان .. بوونە ئاوی سەربەست
چوونە ژێر خاك
لەوەی .. دەرچون بێ باك
هەموو .. بوونە خاك
بۆ خاکی .. پاك.

د. نوزاد یحیی باجگر
7/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

چاوت .. چەمی
دار سپینداره
فرمێسکت .. ئاوی بەهاره
روانینت .. دارستانی بەیاره
ماچت .. ڕزگاری ژان .. و .. ژیانە.

د. نوزاد یحیی باجگر
7/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

مەلەوانی مەل ... لەئاو
فڕینی ماسی لەئاو
سەهۆڵ کردنی ژیان .. لەخەو
خەواندنی ژیان .. بۆ ژوان
دیسان گەڕانیان .. بۆ ژیان
ئەوەیە کارەساتی .. ژیان.



د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

دیتنی .. ڕەنگی چاوت
بێ .. هۆشم ئەکا
ئەگەر ئەتەوی .. نەشتەرگەری
دڵم بکا ..
نابزوێم .. نابزوێم
دڵم .. لێ بکا

د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

بەرد .. لەناو بەرد
ئەڕوێ
تیشك .. بە تیشك
ئەڕوخێ
ژیان .. بەژیان
ئەسوتێ.



د. نوزاد يحيى باجگر
7/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگە .. خۆزگە
لە تێبینی .. سەگ .. م .. زانیبا
لە هەڵمەتی .. مەل .. م .. باڵم .. با
لەهێزی .. ماسی .. م .. مەلەوان .. با
ئینجا .. ئەم .. ووت
خۆزگە .. مرۆڤـ .. .. بام



د. نوزاد يحيى باجگر
4/5/2014
هەولێر

# مامـۆستا ئـەڵـێ

سامانمان .. پێداویستی ژیانە
پێداویستیمان .. لابەری ژانە
دروستکردنی .. بەختیاریە ..

د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

تێگەیشتنی ئاژەڵ
سەرمایەی ... ژیرییە
پاراستنی ژیان .. و .. ژینگە
ژیان پەروەرییە ...

د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

خەڵوز .. ئەڵماس
هەردووك كاربۆنن
فەرقیان .. زەوی .. و .. كمیە
پێداویستی .. نرخیە ...

د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

وەستایی .. فێر بووم لە وەستایان
ئی باش .. وەستای ... زۆر باش
باشیتان .. لەسەر باش ...

د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014
هەولێر

# مامـۆستا ئـەڵـێ

تەندروستی .. خەڵاتی پەروەردگارە
هەستی پاراستنی ... لەلات بەکارە

د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەوانەی ئەخوێنی
چاکە لات ..
پەسندی کە ..
لە کارەکانت دروستی کە ... ؟

د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014
هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵێ

هەرشتێك ، نرخێكی هەیە
بەزۆری نرخی نزم ئەبێتەوە
تەنیا .. زانست
بەزۆری نرخی بەرز ئەبێتەوە ..

د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014
هەولێر



# مـامـۆسـتا ئـەڵـێ

نووسین نەبوایە
زانیین ئەوها کۆ ... نە ئەبوو

د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014

هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

مەرەکەبی .. پێنوسم
وەك تیزاب , زێڕ خاوێن ئەکا
دڵی .. تۆش نەرم ئەکا
بۆ خۆشەویستی .. پێنوس.



د. نوزاد یحیی باجگر
4/5/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کاتی هاتووە .. هەموو بڵێین
بژی کۆماری کوردستان.

د. نوزاد یحیی باجگر
1/5/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خودای گەورە ...
هەموو ڕەنگ .. هەموو دەنگ
هەموو شێوازی .. خەلق کردووە
بەخۆشی .. و .. خۆشەویستی .. یەکجار
ئەخولێمەوە .. لەناو خۆم .. لەدەرەوەی
خۆم
بەهێمنی .. ئازادی .. بێ ئازار.

د. نوزاد یحیی باجگر
1/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

له مەترسی .. ترسی ژیان ..
مەبنە قەڵغانی ..
ترس پەروەران
بەترسمان .. ئەوان ئەبنە .. خاوەنمان

د. نوزاد یحیی باجگر
1/8/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سەربەستی .. سەربەخۆیی
زێڕو .. ماڵ .. و .. حاڵی .. ئەوێ
زێڕی خێزانت .. چی سوودی هەیە
ئەگەر نەبینە ئەمە.

د. نوزاد یحیی باجگر
1/8/2014
هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵێ

سەرت ببەستە .. بەسەربەستی
ئامادە .. نەبی
بۆ .. دانی ... هەموو  پێویستیی
خۆشەویستی
بەڕاستی ... نابیتە
پێویستی .. سەربەستی

د. نوزاد یحیی باجگر
1/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

ساڵانە .. ساڵ .. نایێ
بەهارە .. پایز .. نایێ
زستانە .. باران .. نایێ
چیە .. چی بووە
چی گۆڕاوە ...



د. نوزاد یحیی باجگر
5/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

نانم .. نەبوو
ئاواتم هەبوو
ئاواتم ..
ڕۆژهەڵاتم.

د. نوزاد یحیی باجگر
5/8/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

له .. ژێر چاپی .. چاوەڕوانیان
چاویان .. چاپ بوو
چاپی .. چاپەمەنی .. چاویان
چاپی .. بێ چاو بوو.

د. نوزاد یحیی باجگر
1/8/2014
هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵێ

هەست .. بەساردی ئەکەی
لە گەرما .. ساردی یاد ئەکەی
سارد .. و .. گەرمی
لە لەشی مرۆڤـ تەرازو ئەکرێ
لەشو .. عەقڵم
تەرازووی .. خەڵقی .. خودایا.

د. نوزاد یحیی باجگر
5/8/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ناتوانم .. هەست بەهێزەکانم بکەم
لاوازیەکانم .. هەستی هێزەکانم
ئەجوڵێنێ
بەرەو .. ژانی .. ژوانی .. ژیان.
ئەچەسپێنێ.

د. نوزاد یحیی باجگر
5/8/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سیاسیەکان .. خەونیان
بە میللەتیان .. ئەچەسپێنن
بەزۆری .. حەقی شەرعیەتی فکریان
بۆ ئامانجیان .. مرۆڤ ئەسوتێنن.

د. نوزاد یحیی باجگر
11/8/2014
مال

# مامۆستا ئەڵێ

لە .. بەرژەوەندی خەونەکانیان
مێشکی مرۆڤـ .. ئەخڵوزێتن
خەڵوزی سپی ... ئەچەسپێنن
وەك پەروانە .. هەوا ئەجوڵێنن
بەڵام هەوا .. پەروانە ئەجوڵێنێ.

د. نوزاد یحیی باجگر
11/8/2014
هەولێر–مال دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

چەکم .. قەڵەمە
لەمێشك دەڕوێنی
بەڵام فیشەك ..
یان مردن یان ترس ئەچەسپێنی
کەی قەڵەم .. فیشەك ئەتەقێنی
کە فیشەك کار .. بەقەڵەم ئەدوێنی.

د. نوزاد یحیی باجگر
11/8/2014
هەولێر -مال دریم ستی

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئەوەی .. چاوەڕوانی بەهارمانە
بەهار .. لەگوڵانمانە
.. لەناخمانە
لە .. ڕوانگەمانە
لە .. هەستمانە
لە .. بیر .. و .. باوەڕمانە
ئەم جار .. ساڵی جارێ
ئەڕوێ لە خاکمانە.

د. نوزاد یحیی باجگر
13/8/2014



# مامۆستا ئەڵێ

لەخاك ...
زستان .. بەهار .. هاوین .. پایز
سوڕانی دەورانی .. پەڕەی ژیانمانە
هەروەك .. ڕەحمی ئافرەت
فەسڵی ... ژیان بەخشمانە.

د. نوزاد یحیی باجگر
13/8/2014
هەولێر -مال دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

لە ئاو ... ئاوەدانی ..
ڕەبەسی .. دەرەوە .. و .. ناوەوە
هێزی گیانەوەر
هەموو .. لەئاوە.

د. نوزاد یحیی باجگر
13/8/2014
هەولێر-مال دریم ستی

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

لە .. هەوا
خۆی ئەفڕێ .. و ئەفڕێنی
لەخاك تۆز ئەماڵێ
بە $CO_2$ .. ئاگر .. خاك ئەچەسپێنی

د. نوزاد يحيى باجگر
13/8/2014
هەولێر-مال دريم ستى

# مامۆستا ئەڵێ

له .. ئاگر
هەوا .. ئاو .. خاك
ئەجوڵێنێ .. و .. دروست ئەبی
بە ئاگر .. ئەفەوتێنێ
بزر ئەبی.

د. نوزاد یحیی باجگر
13/8/2014
هەولێر-مال دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

هەوا .. ئەبێتە ئاو ... ئەبێتە خاك
ئەچن بۆ ئاگر
هەرچواریان .. یەكتر سارد ئەكەنەوە
هەرچواریان .. یەكتر گەرم ئەكەنەوە
لەم هێزە .. ووزە دروست ئەكەنەوە
ژیانی لێ دروست ئەكەنەوە.

د. نوزاد یحیی باجگر
13/8/2014
هەولێر -مال دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

نازانم .. ناوی !
ناوی خۆشەویستم
ئەوێ
هەموو .. بڵێن
ئامین.

د. نوزاد یحیی باجگر
13/8/2014
هەولێر-مال دریم ستی

# مامـۆستا ئـەڵێ

هەموو .. ئاوی زەریای زەمین
نایێتە .. هەندێك ..
ئاوی .. سەر زەمین
کە .. لەبەفری کوردستان
هەڵئەقوڵێت.

د. نوزاد یحیی باجگر
13/8/2014
هەولێر -مال دریم ستی

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئاینەکان .. ڕێگای ناسینی خودایا
ڕێگای خودا ..
ڕێگای بەختیاری مخلوقەکانیەتی
لە ئەمیبیا .. تــا .. مرۆڤــ .. چیا
دەریا.. ڕۆژ .. گەلاکسی
ئیتر چی ماوە .. بۆ ئێمە ؟!
جگە .. خۆشەویستی .. و .. جوانی

د. نوزاد یحیی باجگر
18/8/2014
هەولێر.مال دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

ئەڵێم .. بۆ مامۆستای مامۆستاکانیان
خودا .. ئەهێڵێ .. و .. ناهێڵێ
بەڵام .. قرارگای زوڵم
هەرچەند بێ .. ناهێڵێ
ئەوەی بشهێڵێ .. هەرگیز ناهێڵێ
هەستی مرۆڤایەتی ناهێڵێ.

د. نوزاد یحیی باجگر
18/8/2014
هەولێر.مال دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

زەیتون .. هەنجیر ..
درەختی دێمین ..
مرۆڤ رەسەنی دێمیە
بە سەختیش .. بەرهەم ئەدا
ئەگەر بیرڕوێتی .. بەدێمی ..

د. نوزاد یحیی باجگر
19/8/2014
هەولێر.مال دریم ستی



# مـامـۆسـتـا ئـەڵێ

هەستی .. برسیەتی
وە هەستی .. تێری
دوولای هەستێکن.

د. نوزاد یحیی باجگر
19/8/2014
هەولێر.مال دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

هەڵاتن .. لەترس
ترس زیاد ئەکا ..
لەناو خۆت چارەی بکە
ئینجا .. لەدەرەوە چارەی بەردەوامە.

د. نوزاد یحیی باجگر
19/8/2014
هەولێر.مال دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

پەنجا .. پەنجای .. پێنجی
بەنج .. بەنجدراوە
کارەساتی .. روداو
پێشتر بۆی رەخساوە
پێمان ئەڵێن
بەزیرەکی مێشك و .. ماسولکەمان
دروستکراوە
هەرچی ئەزانین .. ئەزانن
بۆ مان دوراوە.

د. نوزاد یحیی باجگر
19/8/2014
هەولێر.مال دریم ستی

# مامـۆستا ئـەڵێ

ئەبێ .. بزانین
خەڵك .. خەڵکی کێیە ...
هاوڵاتی .. ئەرك .. و .. مافە
خاك .. بۆ هەمووانە.

د. نوزاد یحیی باجگر
19/8/2014
هەولێر.مال دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

جەنگ .. چەکی چەکمەبازە
لەبازاڕی سیاسەت جەمبازە
بێ گوناه .. خوێنی مجازە
سامانی میللەت .. بۆیان مرازە.

د. نوزاد یحیی باجگر
19/8/2014
هەولێر.مال دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

خەونیشمان .. سنوری بۆ دانراوە
ئامانجمان .. هێلکەیە لەبن مریشکیان
کورك کراوە
هەستمان .. گوناه .. لە گوێمان
نەبیستراوە
لەناو .. دووئاگر .. بەفر تواوە
گوناهمان .. چیە
ئەی خودای ئاسمان

د. نوزاد یحیی باجگر
19/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

من .. و ..منەکانی ناوم
دوو لایەکانی سەهۆڵ
ناوەندی ئاگری فۆلکانە
دەوری داوە بۆ سارد بونی
هەر .. وەك .. زەوی
ناوی .. ناو ناوەکانی

د. نوزاد یحیی باجگر
19/8/2014
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

له هیچ مەڕوانە
تەنها بە چاو !
بەڵکو ببینە
بە .. دوو چاو
وە هەموو هەستەکان
بینراو .. نەبینراو
هەست کراو .. نەکراو

د. نوزاد یحیی باجگر
24/8/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئاین .. رەوشتە
.. شارستانییە
خۆشەویستیە

د. نوزاد یحیی باجگر
24/8/2014

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خەمت .. خەم نەبێ
بروات .. بەوی هەبێ
و بەخۆت .. هەبێ

د. نوزاد یحیی باجگر
24/8/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

عاشق بی .. باشە
عاشق نەبی .. زۆرباشە
بوونی .. نەبوونی .. مجاشە

د. نوزاد يحيى باجگر
24/8/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کتابی مامۆستا ئەڵێ
ئاوی گوشینی مێشکمە
لە ئاڤێستاوە
هەتا ... هەتایە

17/6/2015

أستنبول/تقسيم



# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
هەموو ... شت
ژەهرە .. و .. دەرمانە
پێویستییەکەی ... دەرمانە
زۆرەکەی ... ژەهری دەرمانە
بۆیە زانین ...
دەرمانە

20/8/2015
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
دیسان ... شەو دابەزی
بە ... خەونی ڕۆژ ڕوناکی
شەوی ... داپۆشی .. ڕەشایەتی تاریکی
دیسان ... شەو .. ڕۆژ
لێم بوونە ... ڕووناکی تاریکستان
ئێستا ئەزانم ... نەبوو لە کوردستان

20/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

ڕوانگای ... ڕەشستان
وەك کۆشکە ... ئازاد بوین
بەڵێ .. لاواز بوین
بەڵام ... بەردەوامی ژیان بوین
هەمیشە ... وا ئەمێنین

20/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
دەرمانی ... نەزانین
لە مسقالێك زانین ... دەست پێ دەکات
هەتا هەتایی ... دەوام ئەکا
نە دەرمان ... بەش ئەکا
نە هەستی ... زۆر زانین



20/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
داماوە ... لە پەرتوکخانە
وەك دەرمانی ... ئێکسپایەر
دەرمانی ئێکسپایەر ... بۆ فڕێدانە
بەڵام کتاب ... هەتا هەتایی
بۆ ... مانە

20/8/2015
هەولێر

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب .. و ... چەندین پەیوەندی
پەیوەندیەکانی ... ژەهرو دەرمان
کتاب ... دەردی بێ دەرمانە
و .. دەرمانی ... بێ دەردانە



20/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... دەرمانە .. و .. دەردیشە
دەرمانی ... دەردە
دەردی ... دەرمانیشە

22/8/2015
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... ساماڵە ... سامانە
ساکارە ... سەردارە
سەیوانە ... سەیرانە
بۆ دروست کردن ...
وەك چیمەنتۆ



22/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
دۆستی ... دروستە
دروستی ... کەرستە
دروست کردنی ... کەرستە
بۆ ... دە روون دروستان

22/8/2014



# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... ئامانجی یەکسانە
زانین ... بۆ خۆشەویستی
دابینکردن ... بۆ مەبەستی
بەکارهێنەری ... خۆشەویستانە



22/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
پێتان .. سەیرەو سەیرانە
بڕوا بکەن ... دەرمانی .. دەرمانە

22/8/2015

هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
لە هاوین ... زستانە
ڕوناك ئەکا ... تاریکی
ئازاد ئەکا ... ناخ
سەربەست ئەکا ... پەیوەندی
پەیوەندی ئەکا ... ڕزگاری



22/8/2015
هەولێر– ماڵ دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

كتاب ... دەرمانە
كتاب ... دروست ئەكا دەرمان
زانین ... ئەكاتە ... سامان
سامان ... ئەكاتە ... خەرمان
خەرمان ... ئەبێتە ... نان
بۆ ... مێشك و ددان

22/8/2015
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
خەون بوو ... کتاب بخوێندرێ
لە ئاسمان
ڕوناك بکا ... گۆڕستان
هەزار ... ملیۆن کتاب
ئێستا ئەفڕن لە ئاسمان
بۆ دۆزینەوەی کۆدی خەلقی ئیلاهی



22/8/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
خەون بوو ... کتاب ببێتە دەرمان
ئێستا ... دەرمان بووە بە کتاب
بخوێنە بە دڵ ... قوڕئان
ئینجا بفڕە ... لە ئاسمان
ئەبیە خدری ... زیندە
نامینێ لە باوەڕت ...
کفرستان

22/8/2015
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
دەرمانی کتاب ... قەڵەمە
مەرەکەبی قەڵەم ... عەقڵە
عەقلی بیرو بڕوا ... کتابە

**8/9/2015**
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... دەردە .. و .. دەرمانە
دەرماڵە .. و .. بەرماڵە
ئەفڕی ... لە ئاسمان
مەلە ئەکا لە نێو ئاو

8/9/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... کەرتی ..کەناری قەڵەمی بێ
نووك
سازان .. و .. ڕوناك .. و .. خۆشەویستی
دروست ... ئەکا
خۆشەویستی ... و ... قین
جیا ... ئەکا

8/9/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... پەرتوکی ... پەڕ ... پەڕی
خاوێن ... ئەکا
پەیوەندی زامداران ... ساز ئەکا
هەڵمی ... ڤۆلکانی ڕەشایەتی
شەنە با ... ئەکا ...

8/9/2015
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... دەرمانی دەردە
دەردی بێ هەستیە
وە کو 14ی مانگ ...
ناخ روناك ئەکا

8/9/2015
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
خاوەنی ... دەریای ژانە
دەرمانی ژانی ... دەریای خاوێنیە

8/9/2015
هەولێر 5/9/2014



# مامـۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ...
ك .. کافەکەی ... کاکائیە
ت .. تائەکەی ... تەوراتیە
أ .. ئەلفەکەی ... ئیسلامیە
ب .. بائەکەی ... بڕواییە



8/9/2015
هەولێر

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... دەرمانی دەردی نەدۆزراوەیە

8/9/2015
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

**کتاب ... دەرمانە**

**کتاب ... ئاوێنەی وێنەی نەدیتراوە**

**8/9/2015**

**هەولێر**



# مامـــۆستا ئـەڵـێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... شەرمەزارە لە نەخوێندەواران

8/9/2015
هەولێر



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

کتاب ... دەرمانە
قەڵای هەولێر ... کتـــابە

8/9/2015
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... دەرروونی ڕزا
لە زامی ... هەستی دزا

8/9/2015
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ....
لە ئاسمان ئەکەوێ
لە بیر ... ئەدوێ
لە هەست ... ئەخولێ
دەرمانی ... لێ ئەڕوێ



8/9/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
ئەڵێن ... وا ... ئەڵێن
کتابیان ... سەنگەری ڕاستیە
ئەڵێن ... ئەڵێن ... وا ... ئەڵێن
ڕاستی چی بکات
لە کتابی ... بێ سەنگەر

8/9/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... دەرمانی کوردستانە
کوردستان ... دەرمانی کتابە
دەرد .. و ... دەرمانم
دەرمانی ... دەردم
کتابە ... کتابە ... کتابە



8/9/2015
هەولێر

# مامـۆستا ئـەڵـێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... کتاب
دەرمانە ... تیمارە
لە دەروون ... بەختیارە
خوێندنی ... کتاب
وەك .. خواردنی دەرمانە
تاڵە .. تاڵە
بەڵام ... دەرمانە

8/9/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... کتاب
کتاب ... دەرد و دەرمانە
چۆنە ... دەردی ..؟
وە .. چۆنە .. دەرمانی ..؟
چیت ... پێ ئەڵێ
هەرچەندە ... نادوێ
بەڵام ... دواندنی
لێ ئەڕوێ ..!

8/9/2015
هەولێر

# مامـۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
خەم خۆرەکانی
هەزارانن ... ملیۆنانن
هەزار ... هەزاران ... کتاب
مردن ....
یەك کتاب ... لە ناویان
هەموویانی ... زیندوو کردن

8/9/2015
هەولێر

# مامـۆسـتا ئـەڵـێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب سەروەری ... دەرمانەکانە
ئەوەی ... دۆزراوە
و ... ئەوەی نەدۆزراوە

8/9/2015

هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... سەیر کردنی
فڕینە ... لە ئاسمانی زانیاری

8/9/2015
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

کتاب ... دەرمانە
کتاب ... کتب ... مکاتیب
ئاڵۆزیان ... لە نەزانینی زانست
دەرمانیان ... لە بێ بڕوایی
هەڵکەندراوە
کتاب ... کتابی ... چاو نەدیت
کتابی ... لە ناخ هەڵکەندراوە



8/9/2015
هەولێر

# مامۆستا ئەڵێ

کتاب ... درمانە
کتاب ... بە خەڵوز
لە سەر دیوار ... ئەنوسرێ
باران ... با ... ئەیسڕێ
بەڵام ... ئەوەی لە ناخ ئەچەسپێ
بە خوێن ... ئەڕوێ

8/9/2015
هەولێر

# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

دەروێش ئەڵێ ..
ماموستا .. و .. شێخ
فێر.. ئەبێ
فڕینی بێ باڵ ...
خۆشەویستی مەحاڵ...
ئارامی ناو چاڵ ...
هەمووکان دەروێشیمان تێدایە.
بەڵام ... ناوێرین ...
بەکاری بێنین.

ماڵ درێم سیتی
12/9/2015

# مامۆستا ئەڵێ

دەروێش ... دەرگای پەمۆی ڕیش ئەکا
ڕیشەکەی .. توندترە ... لە پەت.
بیرەکەی ... بڕواکەی
ڕواندنی بەختیاریە
لە ناوەڕۆکی ژیان

مال دریم سیتی
12/9/2015

# مامـۆستا ئەڵێ

مام ... دەروێش ... ئەڵێ
خۆزگا ... ئەزانن
خۆشەویستی ... چەند سانایە
خۆزگا ... ئەزانن
ئازادی ... چەند ئازایە
خۆزگا ... ئەزانن
دۆزینەوەی .. خۆت ... چەند ...؟!



ماڵ درێم سیتی
12/9/2015

# مامۆستا ئەڵێ

مام دەروێش .. ئەڵێ
جلکی بەعارەقە ڕژاوم
پرچی .. لول .. لولی نەشووراوم
زەنگی دەفی پیستەی نەدۆڕاوم
سەمام ... پێ ئەکا
لە ئاو .. و ..لە .. ئاسمانی ... نەدۆزراوم
بۆنی .. عارەقەم لە سەمای عەشقی
بە ئاوی زەم .. زەم
زەماوەند ... ئەکا
نیاز .. ئەڕوێنێ ...

مالْ دریم سیتی
12/9/2015

# مامـۆسـتا ئـەڵـێ

مام دەروێش .. ئەڵێ
مامۆستا .. وەرە .. لام .. بتفڕێنم
بە هەزەی .. دەفی ئازارم
من .. و .. تۆ .. بفرین
بۆ .. ڕووناکی .. بیر .. و .. بروا

ماڵ درێم سیتی
12/9/2015



# مامـۆستا ئەڵێ

مام دەروێش .. ئەڵێ
مام .. مامی .. مام ... وەستا
من دەروێشی مامۆستام ... ئێستا
من خۆم ... لە دوای هەمووتان .. بەستا

ماڵ درێم سیتی
12/9/2015



# مامۆستا ئەڵێ

مام دەروێش .. ئەڵێ
مەردی مام وەستا
دەروێشی لە خەو لەرزاند
هێمنی .. مام دەروێش
مامۆستای لە ئاسمان فڕاند
مامۆستا .. و .. دەروێش
دوو ... لای ... دوو لایەنن



ماڵ درێم سیتی
12/9/2015

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

عاشقی مردن بووم
لە بوونەوەم .. ئەبم ...و...ئەمرم
هەستم پێی ئەکرد ... نەم ئەزانی
ئێستا ...کە زانیم عاشقی بووم
پرۆسەی دروستکردن ... و ... ڕوخانە
سوڕانەوەی وزەو ... هێزانە
بۆ .. مردی ... و ... زندییانە
بۆیە عاشقی بووم ..
و .. هەمیشە ... عاشقم بوو
لەم .. مەیدانە



15/9/2015

# مامۆستا ئەڵێ

مام .. دەروێش
وەستای بێ مەبەستە
مام وەستای ئێستا
ئەزانی .. لەبەر چی
بێ ئاوازە ... هەموو هەستە
خەونی دەروێش ... مامۆستای مزگەوت
نەبوو
(( قل هو الله احد)) بوو
وامان ئەزانی مامۆستا باشتر ئەزانێ
بەڵام دەروێش باشتر ئەیزانی
قوڵتر بوو هەستی زانینی

ماڵ درێم سیتی
13/9/2015

# ماموٚستا ئەڵێ

دەروونی دەروێشایەتی ... دەرئەنجام
ئەنوێنێ
هەستی بێ ژانی ... بەختیاری ئەڕوێنێ
کارەساتی  ژیان ... مردن ئەچێنێ
مەترسی مردن ... زیندەیی ئەمرێنێ

ماڵ درێم سیتی
13/9/2015

# مامۆستا ئەڵێ

ئاه ... ئاه ... مام دەروێش
توخودا .. بە مردن بڵێ ... بەخێر بێی
ئەی ئەنجامی ژیان

ماڵ درێم سیتی
13/9/2015



# مامـۆستا ئـەڵێ

مام دەروێش ... برۆ .. و .. ڕیش
سپی
دەف ... جەرگ .. و .. حەی .. حەی
بیرم ئەکاتە ... سپی
ئەی خودا ... ناس
مەرگ ... ساز
ژیان ... باز
بفرە ... لە ئاسمان ... بە بەختیاری
ئەی ڕوو سپی

ماڵ دریێم سیتی
14/9/2015

# مامۆستا ئەڵێ

ئازایەتی ... ئازادی
سەربەستیە ....

د.نوزاد یحیی باجگر
19/1/2016
لندن



# مامـۆستا ئـەڵێ

مام ... مامی بەبێ جۆش
خەیرەمەندی بەپۆش
دەربەدەری کۆشش
فڕینی ناوخۆ .. و .. دەرەوەی خۆ
لێت دیارە ... مام دەروێش

مال درێم سیتی
15/9/2015



# مامۆستا ئەڵێ

شنگال .... لە 3ی ئابی 2015 ،
بەرماڵی نوێژی تاووس .... بێ نوێژ بوو.
لە 12/11/2015 .... بەرماڵی ئازادی
چنرا.
بە قوربانی مووی سمێڵت بم ... ئێزیدی.
ئێزیدیەکان ... یەکەم یەزدان ناس بوون.
بە ئاین ... بە ڕەوشت پێناس بوون .
هەزار ساڵ کوژران ..و.. نەمردوون.
هەتا مردن بێزار بوو.

ڕۆژی ڕزگاری شنگال
12/11/2015

# مامۆستا ئەڵیٚ

شنگال ....
وا ... هاتم چۆلەکەکانت ئازاد کەم.
وا .. هاتم .. قین سازکەم.
لە هیشکاتی چیات ... ئاو بەرماڵ کەم.
بە خویٚنم ... بەندەکانت ڕزگار کەم.
شەهیدەکانمان ... لە ئاسمان ... ئاسمان
کەم.
من پیٚشمەرگەی ... کوردستانم.
بۆ ... چاندنی ..
بیر .. و .. بڕوا ... خۆم ئازاد کەم.
شنگال ... بۆت هاتم،
خۆم .. و .. خۆت .. ڕزگارکەم.

ڕۆژی ڕزگاری شنگال
12/11/2015

# مامـۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی ... بەهارم
لە ژیانم ... لە مردنم
دەبی خۆم
بکەمە بەهار
بە .. قوربان ... بوونم
بەهار ... دەینم ...

**15/11/2015**

دبی

# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی ... زەردەخەنەی
حمرین ... سەفین ... ئارارات
بابا گوڕگوڕ ..و .. سوتانی
ناو ... ناخم
زەردەخەنەی ... گریانی
عەزابی بەستەزمانم

15/11/2015

دبی



# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی مەرگێکی
مەرگداری ... ئەمە کدارانم
بە لاوازی ... بە هێزم
خۆشەویستیە هێزم

15/11/2015

دبی

# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی ... ژیانەکم
ژانی نەبێ
ژانەك ... سودی هەبێ
ژان .. و .. ژیان
هاودۆست بێ

17/11/2015
دبی



# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی دەردەکم
دەرمانی ... لە لای
خۆشەویستانم هەبێ

17/11/2015

دبی



# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی لافاوی
مەرگی مەزنم
مردنی ... هەموو لافاو
هەموو مەرگ
هەموو ... زەنگ
ڕەنگ..........
دەنگ..........
لە دەرەوەی زەنگ
ڕەنگ ... دەنگ

17/11/2015

دبی

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

چاوەڕوانی ... هاتنی دەربەدەرانم
لە چاوەڕوانیان ... دەربەدەر بووم

17/11/2015
دبی



# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی ... چوونی نەهاتوان
چوونیان ... لە بیر چوو ... بوو

17/11/2015
دبی



# مامـۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی ... فڕینم
بۆ ... دەرەوەی ژیان
ئێوەش ... ئەتوانن
بفڕن
لە گەڵ من .. وە .. بێ .. من



17/11/2015
دبی

# مامۆستا ئەڵێ

چونکە دەوڵەتم نیە
دونیام کردە دەوڵەتم

ماڵ دریێم سیتی
6/10/2015



# مامۆستا ئەڵێ

گەنجینە .. کۆرپەی دڵینە
سەد ساڵە ئەکوژرێین
هەتا .. ببینە دەوڵەت
بزانن ... گە ر نەبین ؟!
هێدی .. هێدی ئەمرین



ماڵ درێم سیتی
12/10/2015

# مامۆستا ئەڵێ

زانكۆی جیهان
بیر .. و .. بڕوای
زانینی ژیان
ڕێ .. و .. ڕوانگەی
سەربەستی كوردستان
هێز .. و .. سەنگەری
پێشمەرگەی قارەمان
پێشمەرگایەتی ڕاگری
زانست .. و .. ئاوەدانی
شارستانی

سەرۆكی دەستەی ئەمینداریەتی زانكۆكانی جیهان
وتاری دەرچوونی خولی یەكەمی زانكۆی
جیهان – سلێمانی

# مامـۆستـا ئـەڵـێ

داوام .. لە خودا ... کرد
سەربەستی کورد
نازانم ... بۆ ... چی ؟
سەربەست ... نەبوین
وا ... ئەزانم سەربەستی کردوین
بەڵام .. ئێمە .. نەمانکرد

ماڵ درێم سیتی
12/10/2015



# مامۆستا ئەڵێ

ئازاد ... نەوەی .. ئازا ... زادە
نەوزاد ... نەوەی ... نێوی ... زادە
شێرزاد ... نەوەی .. شێر .. زادە
نەوەی ... شێری ئازا
زادە .. لە ... نۆی شێرزادە
بەڵام ... جێگای عەقڵ .. و .. فکر
نیە ... لە ناومان

د.نوزاد یحیی باجگر
18/1/2016
لندن



# مامۆستا ئەڵێ

داوام .. لە خودا .. کرد
بنێری ئاوەدانی
ناردی ... بەڵام نەمانزانی
بۆچیە .. ئاوەدانی
خەتای چیە .. ئاوەدانی؟!
من ئەزانم .. بۆ چیە ئاوەدانی؟

ماڵ درێم سیتی
12/10/2015



# مامۆستا ئەڵێ

خودا .. ناسوتێنێ بەرماڵی بەندەی
ئەپرسم ... چۆن .. ئەسوتێنێ
مە خلوقاتی .. خۆی

ماڵ درێم سیتی
12/10/2015



# مامۆستا ئەڵێ

دوعام کرد .. لە خودا
بپارێزێ دەربەدەری هیوا
داوام .. لێی کرد
هیوام ... بە خودایە

ماڵ درێم سیتی
12/10/2015



# مامۆستا ئەڵێ

عاشقێکم ... عەشقم لێ ڕژاوە
بۆ خۆشمی لێ نەماوە
عەشقی .. وڵاتێکی وونم
هەستێکی بزرم
لە ناوخۆم دەربەدەرم

ماڵ درێم سیتی
15/10/2015

# مامۆستا ئەڵێ

وەك ... بروسك
هەور ... هەڵئەگیرسێنم
باران ... ئەبارێنم
خاك ... ئەقۆڵێنم
هەڵم ... ئەسوتێنم
بۆ دروستکردنی ... خۆشەویستی ژیان

د.نوزاد یحیی باجگر
11/1/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانم ... ئاسمان ئازادم کا
ئاسمان چاوەڕوانە ... خاوێتی کەم
لەشم ... دەروونم ... خۆی خاوێن نەکا
چۆن ئەتوانم ... خاوەنی ... خاوێتی
خۆم ... بکەم ..؟!
ئاسمانم ... دەروونمە
خاوێنی بکەم ... خاوێن ئەمێنێ

د.نوزاد یحیی باجگر
11/1/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

چاوم ... چاو نەبینە
هەستم .. ڤۆلکانی سەر زەمینە
هەستم ... و ... چاوم
چۆن ... ئاشنا ئەبن

د.نوزاد یحیی باجگر
11/1/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هەستەکانم ... لە دەرەوەی ... دەرەوەی
خۆی
بە ... بێ هەستی ما ...
ئازادی ... ئامانج نەبوو
بەڕەلایی ... ئازاد نەبوو
ئازادی ڕووا ... لە خاکی ئامانج
بۆیە ... هەستەکانم
بوونە ... خۆشەویستی
لە ناو خۆم ... لە دەرەوەی خۆم
بژی ... خۆشەویستی
مردنی ... خۆشەویستیش
لە دایك بوونی ... خۆشەویستیە

د.نوزاد یحیی باجگر
11/1/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

ناتوانم پێتبگەیەنم ... هەتا تێبگەی
دەبی پێبگەی ... هەتا تێبگەی

د.نوزاد یحیی باجگر
11/1/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

هەتا ئێستا ... دەسەڵاتی زانیاری
نەگەیشتە هێزی مل ملانێی کاری
سیاسی
دەسەڵاتی کارگێڕیان ... زانیاریە
چونکە دەسەڵاتی زانیاری
سیاسی نەبووە ... هەتا ئێستا

د.نوزاد یحیی باجگر
16/1/2016
هەولێر / ماڵ دریێم ستی



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هەتا ... مامۆستای
خەڵاتی .. خودای ... بۆ وڵات

د.نوزاد یحیی باجگر
16/1/2016
هەولێر / ماڵ دریێم ستی



# مامـۆستا ئـەڵـێ

هەتا ... مامۆستای
گیرفانت... خەزێنەی .. دەرونتە
دەرونت ... خۆبەخشی دروستکردنە

د.نوزاد یحیی باجگر
16/1/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

دڵی خۆت ... جوان بکە
هەموو شت ... ڕەنگ و ڕەنگین
بەختیار ... لە ناو پەرژین
هەستی بەختیاری بێ پەرژین
ئاسوودە نیە ... بۆ هەموو سەرین

د.نوزاد یحیی باجگر
16/1/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

هەستی بەختیاری ... بێ پەرژین
ئاگرە .. و .. لەرزین
ناوەڕۆکی ڕۆژ ... سارد دەکا
بۆ دروستکردنی ... ژین

د.نوزاد یحیی باجگر
16/1/2016
هەولێر / ماڵ دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

نەخۆشی غەریبی ... غوربەتی خۆمم
لەناو .. ناوی خۆم
لەدەرەوەی ... ناو خۆم
نەخۆشیم دەروون ... ڕاز ئەکا
دەوونم لە خۆشی .. نەخۆشی دەروونم
غەریبی غوربەتی ناوخۆم
دەرمان ساز ئەکا

د.نوزاد یحیی باجگر
8/2/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

نەخۆشی ... غەریبی قەڵا
لە ناخم ... وەك شێت جوڵا
جۆڵا ... چنینی جاجمی خۆڵا
خۆل ... خۆلا
دەربەدەر کرا ... قەڵا
منیش بویمە ... دەروێشی دەروونی قەڵا

د.نوزاد یحیی باجگر
8/2/2016
هەولێر / یادی ماڵی باپیرم
حاجی أحمد صمد سعدالله



# مامۆستا ئەڵێ

نەخۆشی ... غەریبی شەوانی .. قەڵا
کە خەستەخانەی جمهوری ... دروست ئەکرا
منداڵ بووم ... نەمدەزانی
لەوێ ... ئەبمە دکتۆر
بومە ... طبیب .. ی .. خۆم
و ... مرۆڤ
بەڵام ... نەمتوانی ... بکەم
تیماری ... قەڵا
ئێستاش ... چەسپێندراوە دیمەنی
لە بناری قەڵا
بەڵام ... خانووەکانی باپیرانم
ڕوخا ... نەیانهێشت ... دروستی بکەم

د.نوزاد یحیی باجگر
8/2/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

له شەفەقی ... ڕۆژهەڵاتی هەولێر
دیار بوو ...
بووە مەڵبەندی ... ئەربائیلۆ
لە پێش مەککە ...
حەجی ئاشور ... و ... زەردەشت بوو
ئاینی تەنیا ... خودا ... بوو
قەڵای هەولێر شار بوو
شارستانی .. بوو
فکری تەنیا خوا ... لێرە لە دایك بوو

د.نوزاد یحیی باجگر
17/2/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

لە شەوی بەدری ... سەرقەڵا
شاهدە شەش هەزار ساڵ ... خۆڵا
خەونی من ... شەش هەزار ساڵ جۆڵا
ڕوانگەم ... بۆ بەدری قەڵا
تەنیا ... خوا
لە چار چاوانی ... بە بێ چرا ... بووە
چوار چرا
لە ژێر تیشکی بەدری
بە بێ ... کات
بووە ... خوا ناس ...؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
17/2/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامـۆستا ئەڵێ

دەگریم .. و .. ئەگرییێم .. وە دەگریم
وەك .. منداڵێكی باب مردوو
..پیرێكی هەست  زیندوو
فرمێسكم ...
وەك .. تەزرە .. و.. بەفر
ڤولكانی ناوم ... سەهۆڵ تر
سەربەستی مێشكم
لە زیندانی ملم
كێوە .. بچم .. ئیتر

د.نوزاد یحیی باجگر
18/2/2016
هەولێر / ماڵ درێم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

فرمێسکم ..لە ناو چاوم سووتا
و لە دەرەوەی ڕوتا
چاووم ..و.. ناخم ئەشوا
وەك .. باران پیسایی ئەخوا

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/2/2016



# مامۆستا ئەڵێ

دەگریم .. و .. ئەگریم .. و ئەگریم
فرمێسکم .. نایەتە خوارێ
چی فرمێسك تامی ما
چی ئازار .. ؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/2/2016



# مامـۆستا ئـەڵـێ

دەگریم ..وە .. ئەگریم .. و هەرگیز
ئەگریم
بەڵام گریانم ... بەختیاریە
لە دەماوەندی شەهیدان

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/2/2016



# مامۆستا ئەڵێ

ئەگریم .. و.. دەگریم .. وە ئەگریم
بەبێ فرمێسك
فرمێسکم .. خنکا
هەستم .. بەبێ دەرگا
بڕوام .. لە دادگا ...

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

ئەگریم .. دەگریم .. وە ئەگریم
فرمێسك لە دەرگای چاو .. وەستا
چاو .. نابینا بوو .. و.. خنكا
فرمێسك ... چاوشۆڕی چاوە
بەڵام .. لە هیشكاتی ... خنكا

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/2/2016



# مامۆستا ئەڵێ

یادگاریەکانم .. شەپۆل ... شەپۆل
دەچنە ناو بیرم وەك سەهۆڵ
وەك مەل ئەفڕن .. پۆل .. پۆل
ئەسووتێنێ ... ئاگری خۆڵ

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ دریێم ستی
21/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

سازەوانی سازی .. سۆز
لە زەماوەندی تیشکی .. ڕۆژ
بە نەهاوەند ..و.. سێگا
هەڵگیرسێنە .. نەمری مۆسیقا ..؟
لە بەختیاری .. دلسۆز

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
22/2/2016



# مامـۆستا ئەڵێ

به قوربانی ... قەبارەی
قەوانی فیشەکت بم
خۆبەخشی .. خوا بەخش
پێشمەرگە ...

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
22/2/2016



# مامۆستا ئەڵێ

ساز .. ژەن
دەف .. ژەن
دۆڵ .. ژەن
ساز .. و .. دەف ..و .. دۆڵ
چی   مەرحبا
هەروەك .. دەن .. بەن .. ژەن



د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
22/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

پەیمان .. بە هەستی سازژەن
ژەنیاری.. ژینی .. پەیمان
دەردی ... ژان
دەردی .. دەردەوەری مان
بۆچی .. ئەچینە
درویێتەی .. درۆ ..
بۆ .. نەمان

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
22/2/2016



# مامۆستا ئەڵێ

کچە .. ڕەوشت پاکی کوردانی
بۆ .. خۆبەخشی سەیرانی
بۆ خۆشەویستی کوردستانی
لە دونیا .. و .. قیامەت

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ دریێم ستی
25/2/2016



# مامـۆستا ئـەڵـێ

**کچە .. قەڵای هەولێری**
**خودا .. خۆشەویستی خۆی**
**لێرە .. ڕواند ..؟!**

**د.نوزاد یحیی باجگر**
**هەولێر / ماڵ درێم ستی**
**25/2/2016**



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئەی کچە کوردی چاو باز
لە چاوی باز .. کورد تری
لە هەستی ئەفلاتوون .. بەرزتری
لە شیعری شکسپیر .. جوانتری
سەربەرزیمان ...
بە ڕەوشتی تۆیە ... ؟

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
25/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

ئەگەر هەستت کرد دەربەدەری
ناوخۆت .. دەرەوەی خۆت
تەرازوویان .. نەترازاوە
ئینجا .. تەرازوو .. نەترازاوە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
25/2/2016



# مامۆستا ئەڵێ

ئەم خۆن ..لە خواندنی خوان
خەونی .. خەوم
خوانی .. بێ .. خوان

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
25/2/2016



# مامۆستا ئەڵێ

من سابوونەکم ... پێویستە
سابوون ....
لە شاری ... سابونکەران

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ دریێم ستی
25/2/2016



# مامۆستا ئەڵێ

پۆستالی ... عەسکەر
لە ئەمری ... مەلیك توندترە
چونکە ... پۆستالەکە
لە پێی عەسکەر ... حوکم ئەکا

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
27/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

هیچ کەسم ... ناوێ
بمری ... بۆ وەتەن
ئەمەوێ .... بژین
بۆ دروستکردنی ... وەتەن

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
27/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

گوڵە ... گوڵاڵە
سۆریت لە خوێتی ... گلە
پەلکی سەوزت ... ڕەنگی گلە
کورتی ژیانت ... ئاهەنگی زلە
گوڵە ... گوڵاڵە
لە سەر کوڵمەی سوزان
تەمەنت ... سەد ملیار
چرپەی ... دڵە ..؟

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
2/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

مام لنكۆلين
نامەكەت ... گەیشت
پاش ... یەك سەدەو نیو
نەوەی ... ئازاد بوانت
بووە ... ئۆباما

د.نوزاد یحیى باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
16/3/2016

# مامـۆستا ئەڵێ

مام .. ئۆباما
نەوەی ... ئازاد بووانی
مامۆستات ... لنكۆلین
ئازادمان كە .. لە دیلی
سایكس ... بیكۆ ...!



د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
16/2/2016

# مامـۆستا ئەڵێ

نانوسم شیعر
هەست ... ئەنوسم
بۆ ڕزگاری ... ئازارم
هەتا ... هەستەکانم
ببێتە ... دەرمانەکانم

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016



# مامۆستا ئەڵێ

ئەوانەی ... ئەنووسم .. و .. نووسیم
ناوی لێ دەنێم
هەست
هەست
هەست
هەست

د.نوزاد يحيى باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

ناهێڵم ... هەستەكانم
وەك خۆم ... بمری

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016



# مامۆستا ئەڵێ

عەشق ... عەشق
تکایە .. وەرە ... وەرە
هەردەم ... هەر ڕۆژ
وەرە ...
تکایە ... وەرە ... وەرە
خۆشەویستی ... بکە خۆش
ژیانم ... جۆش
ڕۆژم ... بکە ڕۆژ
عەشق ... بمکە عەشق

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

عەشق ...
بڕوای ژیانه
روناكی ... هەستانه
بۆ بەختیاری .. بەندەی خوا

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016



# مامۆستا ئەڵێ

**عەشق ... هێلانەی ئاسمانە**

**د.نوزاد یحیی باجگر**
**هەولێر / ماڵ درێم ستی**
**28/3/2016**



# مامۆستا ئەڵێ

عەشق ... هەستە
هەست ... عەشقە
ئەوی تر ... نازانم
بە خوا ... نازانم

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

عەشق ...
بە تەنیا ... ئی عاشقان نیە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016
هەولیر مال



# مامۆستا ئەڵێ

عەشق ...
مەعشوقەکەی ... عەشقی عاشقان
بفرە ... لە عەشق
بژی ... بە عەشق
بمرە بۆ عەشق
عاشقەکانی ... عەشقی مەعشوقەکانم
وەرن .. بۆ عەشق
لە دونیاو ... مەشق

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامـۆستا ئەڵێ

ئەچم ... بۆ دۆزینەوەی خۆم
لە ناو .. و .. دەرەوەی خۆم
عەشق ... ڕوناکی ڕێگامە
ڕێگام ... بۆ دۆزینەوەی خۆم

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016



# مامۆستا ئەڵێ

عاشق ... ئەڵێ
مامۆستا ... هەرگیز .. قوتابی عەشق بووی
چی ... قەوما
عاشق .. نەمای

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

درۆ ... بە عەشق
درۆ ... بە ناوی خوا
درۆ دامەزراندن ...
کارەساتی ... نەزانینی عەشق

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

مامۆستا ...
خەڵاتی عەشق لە منت وەرگرت
مامۆستا ئەڵێ
ئەگەر عاشق بای لێت وەرنەئەگیرا

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016



# مامۆستا ئەڵێ

عاشق ... ئەڵێ
عەشق ... جیاوازی جیاوازانە
مامۆستا ... ئەڵێ
بەڵێ ...

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

عاشق ... ئەڵێ
وەستا ... وەرە
دەرسی ... عەشقم پێ بڵێ
مامۆستا ... ئەڵێ
وەرە .. ببە .. مامۆستام
هیچی ترم ... پێ مەڵێ

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئازارم ... چنینی هەستە
خۆشە ... ویستی ... مەبەستە
لە خۆشیم ... ئازارم کەستە
ڕاستە ... هەستە
هەموو ... هەست ڕاستە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مـامـۆسـتـا ئـەڵێ

مامۆستا ... توخوا  واز بێنە
عەشق ...و ... مامۆستایان نەوتوە
مامۆستا ... ئەڵێ
بە عەشق ... ئەبیتە
مام ... و ... وەستا ... ؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هیچ مەڵێ ... مام  وستا
چۆن ئەبمە .. مامۆستای عاشقان
مامۆستا ... ئەڵێ
سانایە ... ببە عەبداڵی
خولقاندنەکانی ... بە ناسینی خوا
ئەو خودایەی ... ئێمەی خولقاندووە
نەوەك ... ئەو خودایانەی ... ئێمە
دروستمان ... کردووە
بۆ ... ئارەزوەکانمان

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامـۆستا ئـەڵێ

عاشق ... ئەڵێ
عەشقی من ... لە بیر نەکەی
مامۆستا ... ئەڵێ
لە بەهەشتیش ... بە دوات دەکەوم
بەڵکو ... عاشقم ببی

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

عاشق ... ئەڵێ
سەیرم ... دێ
مامۆستا ... و ... عاشقی
مامۆستا ... ئەڵێ
چاو ... جوان
مامۆستایی ... عەشقە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016



# مامۆستا ئەڵێ

عاشق ... ئەڵێ
عەشقی ... عاشقانم ڕۆ
ڕۆ ... ڕۆیی عەشقم ڕۆ
مامۆستا ... ئەڵێ
عەشق کلیلی ... دەریای ئازادیە
عەشق بارانی ... بیابانی ئاسمانیە
عەشق ... هەستی جوانیە
ڕۆ ... ڕۆی .. نیە
عەشق ... ڕاستگۆییە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ دریم ستی
28/3/2016

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

عاشق ... ئەڵێ
خەونم ... نەبوو
ڕاستەقینەم ... نەبوو
ئازارم ... هەبوو
مامۆستا ... ئەڵێ
عاشق نەبووی
ناوت لە خۆت نایە عاشق ؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

عاشق ... ئەڵێ
دەرگام ... لێ بکەوە
ئاسمانم لێ ون بووە
مامۆستا ... ئەڵێ
دەرگا ... دانەخراوە
ئاسمان ... ون نەبووە
عاشقی ... عاشقمەندیت
داخراوە ...

د.نوزاد يحيى باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

عاشق ... ئەڵێ
نەخۆشی ... جوانی مەعشوقەکانم ... جیام
مەکەوە
لە نەناسینی ... ڕاستی شەهیدەکانم ..
ڕاستم بکەوە
لە نەخۆشی دەرونم ... تیمارم کەوە
مامۆستا ... ئەڵێ
ئێستا ... عاشقی
خۆزگا منیش ئەگەیشتم ... بەم ئاستەوە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

عاشق ... ئەلێ
نەمدەزانی عەشق
ئەوەندە ... نەناسە
ئەوەندە ... پڕ هەناسە
دڕندە ... دل باسە
مامۆستا ... ئەڵێ
دڕندەش ... عاشقە
ئەگەر بیکەی ... ناسە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

عاشق .. ئەڵێ
تو ... خوا ...
لێم گەڕێن بحەسێمەوە .. و .. بنووم
مامۆستا ... ئەڵێ
ئەگەر ... عاشقی
نوستن ... و .. حەسانەوەت
بۆ چیە ... بۆ چیە



د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

عاشق ... ئەڵێ
کە چاوت ... بە چاوم ئەکەوێ
ڕۆژم ... لێ هەڵدێ
مامۆستا ... ئەڵێ
تیشکی ... ڕۆژ ... و .. تیشکی چاوی
عاشقان
یەك ... یەکەیە ...؟

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامـۆستا ئـەڵێ

عاشق ... ئەڵێ
جم جمۆکەی ... چاوی عاشقان
خەرمانی ... خدری زیندەییە
زیندەیە .. زیندووە .. لە زیندوایەتی
زیندەیە
بۆیە .. جم .. جمۆکەی چاویان
دروست بوونی .. ڕۆژی چاویانە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

عاشق ... ئەڵێ
مام ... وەستا
هەستا ...
ئاگر .. بەستا
ڕوناكی ... سستا
مامۆستا .. ئەڵێ
عاشقیم .. خەستا
نایدۆزمەوە ... لە تیشكی بەردەستا
عاشق ئەڵی
ئینجا .. مامۆستایت لە سستە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

له شەوقی نووری چاوت
ڕۆژ هەڵدێ
له ڕوونی  جوانی حاڵت
ئاسمان گەشدەبێ
ڕۆژ .. و .. ئاسمان
له جوانی .. و.. شەوقت  .. دێ

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
28/3/2016

# مامـۆستا ئەڵێ

چاو بازی ... ناو  ناز
نازی ناو چاوی باز
هەڵبگیرسێنە بە چاوت
ئاگری .. دڵخواز

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
19/4/2016

# مامۆستا ئەڵێ

چاو ... بازی چاو باز
ڕاز ... ڕازی مراز
خەندەیە چاوت
ژیان ئەکاتە نیاز

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
19/4/2016



# مامۆستا ئەڵێ

چاو بازی ... چاو واز
واز مەهێنە ... لە چاوبازی خواز
چاو بازیت
شەپۆلی ... ألکترومکناتیکە
بەختیاری ئەکاتە ساز

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
19/4/2016



# مامۆستا ئەڵێ

چاو بازی ... تیژ چاو
ئەفڕێنێ ... دڵی داماو
ئەسەلمێنێ ... هێمنی هەرماو
ئەڕوخێنێ پاشماوەی ڕووخاو
لە چوارچێوەی ... دووچاو ..

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
19/4/2016

# مامۆستا ئەڵێ

چاو بازی .. چاو شەرمن
شەرمت لە چاوی دەربازی دوژمن
ئەڕوخێنێ پەیوەندی
چاو .. و .. ناخ

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ دریم ستی
19/4/2016

# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگە ... خۆزگە
نەگۆڕابام ..
لەبەر کوردایەتیم
هەتا ... هەڵنەگیرسابا .. لە ناوم
دژایەتی ...



د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ دریێم ستی
23/4/2016

# مامۆستا ئەڵێ

نابینی ... نابینی
باڵی شەمشەمەکوێرە نابینی
هەر .. وەك لاوازی .. و .. نەزانین
نابینی
وا .. ئەزانی .. ئەیزانی .. و.. ئەیبینی
تەرازوو ... پساوە ...
لە پسانەوەی
بڕوای ... نەماوە ...

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
17/5/2016

# مامـۆستا ئەڵێ

ڕۆڵە ... مەگری بۆ مردنم
بۆ ژیانت زۆر گریام

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
17/5/2016



# مامـۆستا ئـەڵـێ

دەنگی .. ناو ناخت
لە ناو گوێتە ..
هێزی .. گوێ
ڕوناکی هەستی خۆتە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
17/5/2016

# مامۆستا ئەڵێ

ڕۆڵە ... ڕوی ژان
ژوانی سەربەستی خۆتە
ژەهری .. ژانی ژیان
دەرمانی .. خۆتە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
17/5/2016



# مامـۆستا ئـەڵـێ

ڕۆڵە .. ڕوانگەی ڕواندنی ڕەنگ
مەزنترە ... لە دروستکردنی ... هەنگ
سەرسامترە .. لە بزر بوونی دەنگ
دەنگ .. ئەڕوا .. ئەڕوا
شەپۆل .. شەپۆل
هەتا .. هەتا ..
بە بێ سەنگ

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ دریێم ستی
18/5/2016

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ڕۆڵە .. ڕۆڵەی ڕەوشتی نەخوازراو
بە .. تەنیا مەبە بڕیا مەدار
کۆمەڵە .. هێزی پاڵێوراو
لەوانە بڕیاردراو

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/5/2016



# مامۆستا ئەڵێ

ڕۆڵە .. مامۆستام بووی
ڕۆڵە .. پردی پەڕینی مامۆستاییم بووی
ڕۆڵە .. لە تۆ.. فێربووم
هەموو .. مامۆستاییم

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/5/2016



# مامۆستا ئەڵێ

ڕۆڵە ... ڕەوەندی کوێستان
دونیا ... مەزرە بۆتان
ڕەوەند ... ڕۆ ئەکا مەزران
مەزران ... مەزران چاوەوانی ڕواندن
تایبەت بکە ... بۆ خۆتان
مەزران ... و ... ڕواندن

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/5/2016

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

بابە ... من بابە نەمام
بوومە بابی ... خۆم
لە ژیان .. و .. مردن
لە ترس ... دەرچووم

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/5/2016

# مامۆستا ئەڵێ

ڕۆڵە ... لە دەرگای مردن مەوەستە
یان ... بڕۆ ژوورێ .. یان .. یان ؟!
بەڵام ... لەوێ مەوەستە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/5/2016



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ڕۆڵە ... ڕابردووی ... ژیانی ژان
ژوانی ... نیە
شەرمە ... ڕۆڵەم ... ژوانی نیە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/5/2016



# مامۆستا ئەڵێ

ڕۆڵە ... لە دونیا ڕێزبەندی نیە
بازرگانی ... بازاڕی دونیا
لە ڕۆڵەکانی ... ئاگادار نیە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/5/2016



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

## ڕۆڵە ... ڕۆڵت ڕابەری ڕاپەڕینە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/5/2016



# مامۆستا ئەڵێ

ڕۆڵە ... هەموو هونەرمەندی دونیا
پاسەوانی ... ئاساییش
ناجولێنێ
بەڵام ... هەستی هەستیاری
ئەچەسپێنێ
بەڵام ... کێ بە کاری ئەهێنێ
هەستی ... هەستیاری
میلەت ... ئەچەسپێنێ

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/5/2016



# مامۆستا ئەڵێ

خۆشیەکانم
1) هەستی ... هەستەکانم
ون ... بوو لە قۆناغی یەکەمی
وەستانی ... ژیانم
2) لە ئاسمانەوە ... چاوەڕوانم
عەشقی ... خۆشەویستی
بۆ ... قۆناغی دادێ
3) لە سەرەوە ... و ... بنەوەی مردن
هەرگیز ئەتوێمەوە لە تەقینی
ئەتۆمەکانم ... لابد ئەحەسێمەوە
بە عاشقبەندی ... ئەتۆمەکانت
4) ئینجا پێکەوە ... لە دەریای هیچ
ئەچەسپێمەوە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
18/5/2016

# مامۆستا ئەڵێ

فرمێسکی ... ڕۆژی سوتاو
ئەزانی ... بە چی ڕوداوێك سوتای
بە دەرماڵەی ... وەرزی هێزی خوناو

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
8/8/2016

# مامۆستا ئەڵێ

ئاگری ... جەنگی نەزان
هەڵگیرسا ... لە قین .. و .. قەیوان
ڕاوەستا 8 / 8 /1988
بۆ ... دروستکردنی .. قەیران
بۆ هەموو ... جیهان

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
8/8/2016
1988/8/8
28 ساڵ



# مامۆستا ئەڵێ

بە گریانم ... و ... کەیفیان هاتم
با بە کەیفم ... و ... گریانیان بڕۆم

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
8/8/2016



# مامـۆستا ئەڵێ

به کەیف بە .. ڕۆڵە
کێ وەك تۆی کرد
وتی باوکم
کە پێشوازی کردم

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
10/8/2016

# مامۆستا ئەڵێ

کە ... ڕۆیشتم
ئەگەر گریان بۆمن
بۆتان ئەگریم
مەهێڵن بگریم ... لەوێش...؟!

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
10/8/2016



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

که ... ڕۆیشتم
له هەست ... دەرئەچم
له ئەزەلیت ئەفڕم
له مادییت ... ڕوحساز
دروست ... ئەکەم
بۆیە ... بە کەیفم ... بە ڕۆیشتنم

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
10/8/2016



# مامۆستا ئەڵێ

کە ڕۆیشتم ... هیچ ناگۆڕێ
من .. منەکانم ئەگۆڕێن
بێ ئەوەی ... بزانم
گۆڕینی ... گۆڕانی
ڕێگای خۆی ... ناگۆڕی
هەتا ... بۆ ڕۆیشتنی ڕۆژ
یان ... گەلاکسی
ڕێگای ... گۆڕینی ... گۆڕانی
ناگۆڕی

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
10/8/2016

# مامۆستا ئەڵێ

ئەوانەی ... هەتا ... لە جەهالەت
نازانن ... مەلە بکەن
چۆن داوای ... گۆڕانکاری
گۆڕان ... ئەکەن

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
10/8/2016



# مامۆستا ئەڵێ

که ... ڕۆیشتم .. ڕۆیشتن مەکەن سوود
سوود ... لە ڕۆیشتن دایە
و ... لە پێشی ... لە پاشی
سوود ... هەتا هەتایە
بە هەستە ... یان بێ هەست

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
10/8/2016



# مامـۆسـتا ئـەڵـێ

به داخەوە ... هەموومان
ئەسیری ... فیكری خۆمانین
سەربەستی ... و ... ئازادی
ئاسوودەی .. ئارەزووی خۆمانین
زانین ... و ... نەزانین
ڕستەی ... پێویستی پێویستمانە
له ژێر چەتری ... دراو
له ڕۆژ خۆمان ئەپۆشین
سەد ساڵه كوردایەتی ئەكەین
نازانین بیست ساڵه قەومیات نەماوە
ئێمه له ژێر صفر ئەجەنگین
ئەمرین ... به خۆڕایی
ئێمه له كێ ... دونیا له كێ

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
4/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

دڵی خۆم ... شاردەوە
لە ناو خۆڵی ون بوونم
ئارمی خۆم ناشتووە
لە ناو ڤۆلکانی دەربەدەر بوونم
دەردی خۆم ... ڕشتەوە
لە دەرەوەی ساخلەمی شێت بوونم
دڵی خۆم لە ناوی خۆم
ون بوو ... لێم

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
4/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

سەر بە دەستی ... و .. سەربەستی
ملاکێك ... و ... سی مەنجەڵ
کوندەییێکی ... سەر نەبەستراو
دۆیەکی ... ڕژاو
بە دەستی ... نەبیندراو
لە سەر دەستە ... لە بن دەستە
لە سەر بەستە ... لە بێ دەستە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
4/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

خەونێك بوو ... سەربەست بین
کە سەربەست بووین
سەربەستیمان ... دیل کرد
نەمانزانی .... لە ناخمان
هەر دیل ... ماوین

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
4/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

ئاواتێك بوو ... سەربست بین
كە سەربست بووین
ئاواتی ... سەربستیمان .. نەما
بزر بووین لە خەما
خەمی ئازادی ... لە سەربستی
سەربستی ...
ئاواتە ... یان ... ئازادی

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
4/2/2016

# مامۆستا ئەڵێ

چوار چێوەی سەربەستی ... بەڕەلاییە
بەڕەلایی ... چوارچێوەی نیە
بەڕەلایی ... و ... سەربەستی
بەینیان ... چوار چێوە

د.نوزاد یحیی باجگر
هەولێر / ماڵ درێم ستی
4/2/2016



# مامۆستا ئەڵێ

ڤۆلکانی .... کوردستان
بەفر ... بارانە ... لە سەر ڤۆلکان

د.نوزاد یحیی باجگر
11/3/2016
استنبول



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

تۆ ... خودا ...
خودایەتی .... خودای گەورە
لە بیر ... نەکەن

د. نوزاد یحیی باجگر
9/3/2016



# مامـۆستا ئەڵێ

ڤۆلکانی .... کوردستانی
ئاگری .... زستانی
زەماوەندی .... نەورۆزی
نەورۆز ... پیرۆز
کوردستان ...
نەورۆزت ڕۆژ
ڕۆژت ...
ڕوناکی  ڤۆلکانمان ....
ناڕوخێنێ ...
بە پیت ئەکا .... وڵات

د.نوزاد یحیی باجگر
11/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

ئەمەوێ ... بزانم
دەماوەندی ... نەزانینم
هەتا ... کەی دەماوەند ئەکەم
بێ ... ئەوەی بزانم .. بۆ ؟

د.نوزاد یحیی باجگر
11/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

فۆلکانی ... کوردستان
مەشخەڵی ... ئاوەدانی
ئازادی ... کوردستانی
مەشخەڵی ... فۆلکانی
فۆلکانی ... ئاگر سوتانی
خۆمان .. و .. ئەوانی دی

د.نوزاد یحیی باجگر
11/3/2016



# مامـۆستا ئەڵێ

فۆلكانی كوردستانی
مەڵبەندی پێكەوە ... ژیانی
ئارەزووی خۆشەویستی .. و .. میوانی
هەرسێ دراوسێمان ... با بزانی
ئێمە ... بۆ ئەوان ... قوربانی

د.نوزاد یحیی باجگر
11/3/2016

# مامۆستا ئەڵێ

فۆلکانی ... کوردی
ئاسمانی ... بزر کرد
خاکی .... بە پیت کرد
ئاوەدانی ... جوان کرد

د.نوزاد یحیی باجگر
11/3/2016



## مامۆستا ئەڵێ

سەما .. و .. سەیران
سەیرانی خۆشی ناوخۆ .. و
سەمای فڕینی دەرەوەی خۆ

د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن



# مامۆستا ئەڵێ

سەما .. بکەن لە سەیران
لە سەیرانی ژیان .. و .. مردن
مردنی .. ناوخۆ .. و .. دەرەوەی خۆ

د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن



# مامۆستا ئەڵێ

هیچ .. نەبووە لە هیچ
هیچ .. هیچ نەبووە

د.نوزاد یحیی باجگر
22/1/2016
لندن



# مامۆستا ئەڵێ

سەما .. و .. سبەینێ
ناخ لە سەما سەنگینە
هاتنی سبەینێ ڕەنگینە
بۆ .. سەماو .. سبەینێ
لە بیر بکە ... دوێنێ

د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن

# مامۆستا ئەڵێ

هیچ دابەشی هیچ بکەی
هیچی لێ دەرناچێ
هیچ جاران هیچ بکەی
هیچی لێ دەرئەچێ
بۆ .. چونکە هیچ بە دروستکردنی
فکری مرۆڤ ... ژیاندار نەکراوە
ئایا ... هیچ لە کن ڕیوی هەیە
هیچ لە ژیانی درەخت هەیە
هیچ لە ژیانی خولقاندن هەیە
ئێوە فکری لێ بکەن

د.نوزاد یحیی باجگر
22/1/2016
لندن

# مامۆستا ئەڵێ

هیچ ... نەما .. لە هیچ
هیچ .. بکەم
لە هیچ ...

د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن



# مامۆستا ئەڵێ

سەمبا ... سەمای ئارامی
ڕەنجبەرانە ...
بە خۆشی ... خۆشەویستی
ڕەنجیان ... ئەجوون
ئەیکەنە .. نان .. مان .. دووان

د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن

# مامـۆستا ئـەڵێ

هیچ ... نەبێ
هیچەکانیش نییە
هیچ نەبێ ...
لە هیچ ... کەمتر
و .. لە هیچ زیاتریش
نیە ...؟
بەڵام .. مادە .. و .. زانست
دەبێ هەبێ
چونکە ... ئیشیان بە هیچ نیە
چونکە هیچ .... فیکری دروستکەری
دروستکەرانە ...

د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن

# مامـۆستا ئەڵێ

سەما ...
لە بناری ئاوی ... سیروان
سەیر .. و .. سەیر
ئەدوێنێ بۆ خۆشەویستی
نیشتیمان

د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن

# مامۆستا ئەڵێ

لە ... هیچەوە
بوومە ... خۆم
هیچ ... بدۆزنەوە
هیچ ... ناتاندۆزێتەوە

د.نوزاد یحیی باجگر
22/1/2016
لندن



# مـامـۆسـتا ئـەڵـێ

سەبر ... لە سەما
لە سەیران
لە کوردستان
پێویست .... نیە

د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن



# مامۆستا ئەڵێ

هیچ .. هیچ کۆمان نیە
لە هەستی ... فڕینی ناخ
لە دیسکۆی ... ڕاك
هیچی لە هیچ نیە
تەنیا شێوازی ...

د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن



# مامـۆستـا ئـەڵێ

سەمبای بەڕازیل
لە سەمای کوردستان
جوانتر ... نیە
لە چوار چێوەی جوانییان
داناوە ...
ئێمەش ... بە گوناهمان
داناوە ...

د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن

# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

وەك من سەرتان
بە هیچ مەشێوێنن
تەنیا ... هیچ
بە پێی تەرازوو هەڵسەنگێنن

د.نوزاد یحیی باجگر
22/1/2016
لندن



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

سەردەمی ... سەمایا
سەرهەد .. و .. سەهۆڵ
سان ... بوون .. لە سەما
سەما .. هەرما .. لە سان

د.نوزاد يحيي باجگر
21/1/2016
لندن

# مامۆستا ئەڵێ

هیچ هاواری لە سفر
هەڵسا ....
چۆن ئەبێ ژمارە ..
بە هیچ بدەن
هیچ ناژمێردرێ ....
هەست ناکرێ ...
تەنیا ... بە زانستی دەرەوەی
تەکنەلۆژیا ...
هەڵدەسەنگێندرێ

د.نوزاد یحیی باجگر
22/1/2016
لندن

# مامـۆستا ئەڵێ

سەرهەنگ ..و..هەنگ
هەرگیز .. لە ساما
سەمای ... ژانا ..
ژوانی ... ژیان
هەنگین .. دروست ئەکەن
بە سەما ...



د.نوزاد یحیی باجگر
21/1/2016
لندن

# مامۆستا ئەڵێ

هیچ .. لە هیچمان
هیچ ... نەبووە
زاخی ئاوەدانی هیچی هەندەکان
هیچەکانیان ڕەواند
مانای هیچ بەری نەدا

د.نوزاد یحیی باجگر
22/1/2016
لندن



# مامۆستا ئەڵێ

ساردی .. سەما
سەم ... ئەسوتێنی
گەرمی ... سەما
ناخ ... ئەجوڵێنی
جوڵاندنی ... ناخ
سوتاندنی ...سەم
ژیان .. ئەبزوێنێ

د.نوزاد یحیی باجگر
22/1/2016
لندن

# مامـۆستا ئەڵێ

هیچ ... لە هیچەکان ناکەم
لە ژیانەکان ...
و ... لە مردنەکان
چونکە هیچ نیە
پێش .. ژیان
پاش ... مردنیش
نیە

د.نوزاد یحیی باجگر
22/1/2016
لندن

# مامۆستا ئەڵێ

ئەی .. عود ژەنی مەیخانە
چاوت ... هەڵبێنە
وائەزانم ... نابینی
کە ئاوازی ... تاج ...
خۆ بەخشەی .. هەڵئەجۆشی
وام زانی نابینی
بەڵام نابینی خۆم
لە ئاوازی ... چاوت بینی

د.نوزاد یحیی باجگر
9/3/2016
استنبول

# مامـۆستا ئـەڵێ

ئەی عود .. ژەن
چاوت .. دابەسراوە لە ئاوازی
سۆزی ... عودت
وام ... زانی .. نابینی
بەڵام ... دیارە من نابینام
چاوم ...لە ئاوازت .. لە کار دەرچوو

د.نوزاد یحیی باجگر
9/3/2016
استنبول



# مامۆستا ئەڵێ

عود ژەنی ... ژانی سۆز
لە پۆشینی ... چاوت .. ناخت
چاوت ... هەڵبێنە ....
قوربانی ... چاوت بم ...
لێم دیارە ... ئازادی ژانت
لە پۆشینی ... چاوت
نە ... نەبینی ... نەبینی
ناخت ... ئارەزووی ژانت
ئەبێتە .... لافاو
ئەستێرەی ... ژیان
هەڵبقوڵێ ... هەڵبقوڵێ
کانی ... ئاوەدانی ... ئاوەدانی

د.نوزاد یحیی باجگر
9/3/2016
استنبول

# مامـۆستا ئـەڵێ

ئەی ... مۆسیقا ... ژەن
ژانی ژوانی ... ژێر ژوان
ژانی ... ژوانت
ژەهری ... مەرگی ژان
ژان ... نەما ... لە ژووان
پاشی خۆشەویستی ... شان
ژان ... ژووان .. شان
ئەبنە ... ئاوەدانی ژیان

د.نوزاد یحیی باجگر
9/3/2016

استنبول

# مامۆستا ئەڵێ

(1)

پەیکەری جەمالی
جوانی ناخمی نەجات دا ...
شەونمی سەر شەوبۆ
دەست نوێژمی شکاند
گوڵە ... حاجیلە
تەمەنی ... دەریایی بەزاند
هەنگ ... لە ژیانیدا
وەك ...و .. باڵدار
عارەقەی ڕژاند

د.نوزاد یحیی باجگر
11/2/2016
هەولێر-دریم ستی

# مامۆستا ئەڵێ

(5)

ئێمە .... مەشخەڵمان

ئازادی .... ئازادییە

د.نوزاد یحیی باجگر

11/2/2016

هەولێر-دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

جەنگاوەرین ... بەڵام
نازانین ... خەڵاتی
بردنەوەمان ... وەرگرین

د.نوزاد یحیی باجگر
27/1/2016
قبرص



# مامۆستا ئەڵێ

جەنگاوەرین ... بەڵام
بۆ ... کێ
جەنگاوەرەکان ... نازانن
بۆ ... سوودی کێ ...
کێیە ... ساحێب قران
قڕانی .... کێ ؟
قرار ..... ئەدا
و ... بۆ .... کێ

د.نوزاد یحیی باجگر
27/1/2016
قبرص

# مامۆستا ئەڵێ

جەنگاوەرین ...
بۆیە .... جەنگاوەرەکانی
جیهان ... ڕۆمان ..
ئەسکەندەر ... ئاشوور
پالیان ... بەمەداوە ...
بۆ .... چیایەکان
نەهاتوونە ... ناومان
خۆزگا ... ئەهاتن
دەهاڕاین ... وەکو .. گەنم و جۆی
شارستانیەکان ...
نانمان ... لێ دروست ئەکرا
بۆ ... خۆمان .. و .. بۆ ئەوانی دی

د.نوزاد یحیی باجگر
27/1/2016 / قبرص

# مامۆستا ئەڵێ

جەنگاوەرین ...
جەنگی ... یەکتر کوشتن
بۆ ... ڕۆژهەڵاتنمان
بۆ ... ڕۆژئاوابوونمان
هەتا ... ئەوان بمێنن
لە ناومان
بخۆن ... ناخمان

د.نوزاد يحيى باجگر
27/1/2016
قبرص

# مامۆستا ئەڵێ

ئازایەتی ... پیشەی ئازادانە
سەربەستی ... چارەی ئازادانە
ئازاد .. بوون
لە ... بوون .. لە نەبوون
ئازایەتی ... سەربەستانە

د.نوزاد یحیی باجگر
18/1/2016
لندن



# مامۆستا ئەڵێ

(1)

کەروێشك .. و .. ڕێوی .. و .. گورگ
وڵاتمان ... چوار پارچە ...
و ... چەندین دورگە ..
وەك .. کەروێشك
زاوزێ ... دەکەین
نابینە ... خۆراکی
ڕیوی ... گورگ
چوار دەرگامان بۆ هەڵاتن
یاخود ... خودا بەشمان ئەکا ..
هەرگیز ... بەسە ..
با .. بزانین چۆن ئەبینە
ڕێوی ... و ... گورگ

# مامـۆستا ئەڵێ

(2)

ڕێویەتی .... کەروێشك نایزانێ
گورگایەتی ... ڕێوی نایزانێ
کوردی ... کەروێشك
لە بەینی .. ڕێوی فرس
گورگی تورك
ئەدی عارەب
هەم دەخوا ... هەم دەبـــا
خودایا ... دینگەی لاوازی
لە ناو .... جەرگمان
ئێمە ... بەندەی تۆین
بمانپارێزە ...



# مامـۆستا ئەڵێ

(3)

یەکەم ... بڕوامان
بە گەورەیی تۆ... بوو
دووەم ... بڕوامان
بە پێغەمبەری تۆ ... بوو
نە .. ڕێوی .. نە گورگ
نە دڕندە ..... نە فێڵ باز بووین
بۆ ... لاواز بووین
بە گیا .. و ... بەرهەمی خاك
خۆمان ئەحەواند
بە ... فەڕخەکانمان
ڕێوی ... و ... گورگمان
ئەحەواند ...

# مامـۆستا ئەڵێ

**(4)**

خەڵاتی ... خەونمان
ماڵێکی ... سەر زەوی
یەك دەرگاو ... سێ پەنجەرە
میوان بێ ... لە دەرگا
هەوا .... لە پەنجەرە
نەك وەك ... گورگ .. و .. ڕێوی
دەرگایان ... لێ گرتووین
پێمان ... ئەڵێن
وەرنە ... دەرێ
هەتا ... بتانخۆین
جنجرۆك ... ددانمان
ناپانکوژێ
زاوزێمان .. قینیان
هەڵئەمژێ

د.نوزاد یحیی باجگر
28/1/2016 - قبرص

# ژیاننامـــه

## د. نەوزاد یەحیا سعید خدر ئەلیاس محەمەد باجگر

١) لە رۆژی ٢٨ شوباتی ساڵی ١٩٤٨ی زاینی لە هەولێر لە دایکبووە.
٢) باوکی یەحیا سەعید باجگرە و دایکی مەکییە ئەحمەد سەمەد سەعدولڵایە، سێ براو و چوار خوشکی هەیە.
٣) قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لەقوتابخانەی فەیسەڵییە و دواتر لە ئەربیل ئولا ئیبن خەلەکان بە زمانی کوردی تەواوکردووە، مامۆستایان ناسح داود لە (حساب) بیرکاری و فوئاد موعەلیم لەوێتەکێشان یەکەمین مامۆستای ئە و قۆناغەی بوون.
٤) قۆناغی ناوەندی لە دواناوەندی هەولێر خوێندووە و مامۆستا(مەکی) یەکەمین مامۆستایی خوێندنی ناوەندییەتی.
٥) قۆناغی دواناوەندی، لە دواناوەندی هەولێر تەواوکردووە، مامۆستا خەلیل عەبدوڵلا یەکەمین مامۆستای ئەو قۆناغەی بوو.
٦) لەپایزی ساڵی ١٩٦٧ لەکۆلیژی پزیشکی ـ زانکۆی موسڵ وەردەگیرێت.
٧) ساڵی ١٩٧٣ـ ١٩٧٤ خوێندنی زانکۆ تەواو دەکات و دەبێتە پزیشك.
٨) ساڵی ١٩٧٤ـ١٩٧٥ دەبێتە پزیشکی نیشتەجێ و پاشان سەرۆکی پزیشکانی نیشتەجێ.
٩) ئەندامی بەشداری یەکێتیی نووسەرانی کورد بووە لەبەغدا ساڵی ١٩٧٠-١٩٧١.

١٠) لەساڵی ١٩٧٥- ١٩٧٦ راژەی سەربازی ئیلزامی دەیگریتەوە و لە شار و شارۆچکەکانی (زاخۆ، هەولیر، رواندز) وەك پزیشکی سەربازی دەست بەکاردەکات.
١١) ساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧ وەك پزیشك لەگوندو ئاواییەکانی ناوچەی گەلاڵە خۆشترین ساتەکانی ژیان بەسەردەبات.
١٢) وەك پزیشکی پسپۆری گشتیی لە مستەوسەفی سیتاقان لەهەولیر دادەمەزرێ.
١٣) دەبیتە پزیشکی ئیمرجنسی لەنەخۆشخانەی کۆماری لە هەولیر.
١٤) دەبیتە پزیشکی راهینەر لە نەشتەرگەری دڵ و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن و پاشان نۆرینگەی تایبەتی ئیواران دەکاتەوە.
١٥) یەکەمین سەنتەری نەشتەرگەری دڵ و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن لەکوردستان و لە هەولیر دادەمەزرێنێ، لەگەڵ د. ولید خالد لەنەخۆشخانەی جمهوری ساڵی ١٩٨٢.
١٦) لەوەزارەتی تەندروستییەوە دەگوازریتەوە بۆ وەزارەتی خوێندنی باڵا ـ کۆلیژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەددیین ١٩٨٣.
١٧) راهێنانی نەشتەرگەری دڵ وسیینگ لە - مدينة الطب - لەبەغدا ئەنجام دەدات لەژێر سەرپەرشتی مامۆستا یوسف نعمان ساڵی ١٩٨٣ و لێکۆڵینەوە لە پسپۆری نەشتەرگەری دڵ و سینگ ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٧ ، زانکۆی بەغدا – مدينة الطب، لە نهۆمی نۆیەم، چوار ساڵی لێکۆڵینەوەیی و راهێنان لەوێ تەواو دەکات.
١٨) دوای تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە - مدينة الطب، کۆلیژی پزیشکی زانکۆی بەغدا لەتشرینی یەکەم ساڵی ١٩٨٧ دبلۆمی باڵای نەشتەرگەری دل و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن وەردەگرێت.

١٩) دەگەڕێتەوە شاری هەولێر  وەك پزیشکی پسپۆری نەشتەرگەری دڵ وسینگ لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەددین دەست بە کاردەبێت.
٢٠) وەك پزیشکی پسپۆر لە نەخۆشخانەی (رزگاری) لە هەولێر لە سالآنی ١٩٨٧ـ ١٩٨٨ دەست بەکار دەبێت.
٢١) ساڵی ١٩٨٨ دەگوازرێتەوە بۆ کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موستەنسەرییە، نەخۆشخانەی یەرموك، عیادەی پزیشکی تایبەتی خۆی لە بەغدا شەقامی مشەجەر، بالآخانەی باقر ئەلباقر دەکاتەوە هەتا ١٩٩٦.
٢٢) ساڵی ١٩٩٦ ئەچێ بۆ تورکیا و مێرسین.
٢٣) پرۆسەی هونەری شێوەکاری لە خانوی تایبەتی ـ ژوری وێنەکێشانی خۆی لە کۆمەڵگای سولی لە لێواری دەریای ناوەست دەسپێکردوە.
لەبواری هونەری تەشکیلی(٢٢٠) تابلۆی هونەری تەشکیلی کێشاوە.
لەبواری شعریشدا چەندین شیعری ئازادی کوردی و عەرەبی نووسیوە.
٢٤) سالێ ٢٠٠٣ دەگەڕێتەوە زێدی باب و باپیران لە شاری هەولێر، چالاکییە خزمەتگوزاری و بازرگانی و زانین و زانستییەکانی پەرەپێدەدات، لە تەواوی شارەکانی کوردستان و عێراق دا چالاکانە خزمەتگوزارییە زانسستیی و بازرگانییەکانی گەشە دەکەن.
٢٥) بەشداری دەکات لە پرۆسەی بوژاندنەوەی ئابوری و وە بە رهێنان لە کوردستان و عێراقدا.
٢٦) چەندین کۆمپانییای جیهانی لە دوبەی، مێرسین، عێراق، سریلانکا و بەریتانیا دادەمەزرێنێ.
٢٧) ساڵی ٢٠٠٧ زانکۆی جیهان ـ هەولێر دادەمەزرێنێ.
٢٨) سالی ٢٠٠٩ بانکی جیهان بۆ وەبەرهێنان لە عێراق  دادەمەزرێتی.
٢٩) قوتابخانەی جیهان بۆ سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی دادەمەزرێنێ.

٣٠) سەرۆکی ئەنجومەنی جیهان ـ بۆ ئاوەدانکردنەوەیە.
٣١) سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری جیهان ـ بۆ خزمەتگوزاری نەوتە.
٣٢) سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری خێرخوازی حاجی یەحیایە.
٣٣) دامەزرێنەری ئێزگەی رادیۆ و تەلەفزیۆنی جیهانە لە هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٨ .
٣٤) دامەزرێنەری زانکۆی جیهان ـ سلێمانییە لە ساڵی ٢٠١١.
٣٥) دامەزرێنەری زانکۆی جیهان ـ دهۆکە لەساڵی ٢٠١٣.
٣٦) دامەزرێنەری مەڵبەندی راوێژکاری و توێژینەوەی زانستیی و یاسایی جینۆسایدە.
٣٧) دامەزرێنەری یانەی وەرزشی جیهانە لەساڵی ٢٠١٠ .
٣٨) ئەندامی کۆمەڵەی جیهانییە بۆ نەشتەرگەری دڵ.
٣٩) ئەندامی کۆمەڵەی ئاسیاییە بۆ نەشتەرگەریی دڵ.
٤٠) ئەندامی ئەنجومەنی پزیشکان، رۆژنامە نووسان، ژووری بازرگانییە.
٤١) دامەزرێنەری کۆمەڵەی دۆستایەتیی گیانەوەرانە.
٤٢) دامەزرێنەری کۆمەڵەی پاراستنی ژینگەیە.
٤٣) خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری زانکۆی جیهانە.
٤٤) تا ئێستا دەیان کتێبی چاپکردووە، لەوانە: (ووشە دەچێنم، ازرع الكلمات ، في الله، الموت، پێشمەرگە، کوردستان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا(١٠بەرگ)، الالبوم فن التشكيلي ، زنجیرە پەرتوکی مامۆستا ئەڵێ ...).
٤٥) چەندین کتێبی تازەی ئامادەی چاپە لەوانە (ئاشتی، لیلا، هزر ...).
٤٦)سەرۆکی ئەنجومەنی ئەمینداریەتی زانکۆکانی جیهانە (هەولێر، سلێمانی، دهۆك).
٤٧) سە رۆکی ئە نجومە نی ئە مینداریە تی زانکۆی (ئەربیلی نێودەوڵەتی)یە.

٤٨) دامەزرێنەری (ئەکادیمیای جیهان)ــە بۆ پەرەپێدان و فێرکردنی پیشەیی.
٤٩)کۆلێژی قەڵا بۆ دیراساتی ئاینی لە ساڵی ٢٠١٨ دادەمەزرێنێت.
٥٠) لە دامەزرێنەرانی یەکێتیی وەبەرهێنەرانی کوردستانە.
٥١) ئەندامی رێکخراوی ئاشتی جیهانییە، رۆژی (٢٠١٦/٦/١٤) دەبێتە باڵیۆزی ئاشتی جیهانی لە کۆنگرەی ئاشتی جیهانی کە لە تونس بەسترا.
٥٢) پرۆژە ئایندەییەکانی بریتین لەمانە:
١) دامەزراندنی تۆڕی زانکۆکانی نێودەوڵەتی(International Network of Universities) بە مەبەستی بوژاندنەوە و پەرەپێدانی زانست و زانیاری لە نێو گە لاندا.
٢) کردنەوەی زانکۆ لەشارە گەورەکانی عێراق و کوردستان.
٣) خوێندنی مافی منداڵان و ئافرەتان لەقوتابخانەو زانکۆکاندا.
٤) بڵاوکردنەوەی پرۆژەی نا بۆ توندووتیژی خێزان، ئافرەتان، منداڵان.
٥) دامەزراندنی نەخۆشخانەی فێرکاری جیهان و پاشان کردنەوەی کۆلێژی پزیشکی و دەرمانسسازی و پەرستیارییە.

بڕوام وایە (تەنیا چارە ... زانین و کارە)

"The only solution is education"

پزیشکی ڕاوێژکارییە، هونەرمەندی تەشکیلییە، شاعیرو بزنسمانە.